بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: شەرحی کتێبی زغل العلم ی الذهبي

نووسین: احسان برهان الدين

نـەخـشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاكى

نـەخـشەسازیی بەرگ:

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٣ کۆچی – ٢٠٢٢ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « »ی ساڵی «٢٠٢٢»ی پێ دراوە.

## كورتەیەك دەربارەی كتێبەكە

كتێبی (زَغَـلُ العِلْم) یـان بە پێی جیـاوازی مەختوتەكـان پێیشـی دەوترێت: (بیان زغل العلم) و (زغل العلم والطلب).

یەكێكە لە كتێبە كانی مێژوونووس و زا نا وفەرموودە ناسـی گەورە شـمس الـدين الـذهبي التركماني بە ڕەحمەت بێـت، جیـاواز لە كتێبە كانی تری، ئەم كتێبەی چە ند لاپەڕەیەكی كەمە و دەكرێت ناو بنرێت نامیلكەیەك بەراورد بە كتێبە كانی ئەو زانایایە كە كتێبی هەیە دەگاتە دەیان بەرگ بۆ نموونە كتێبی (تاريخ الاسلام) ە كەی.

لەم زنجیرە باسەدا، هەوڵ ئەدەم تیشك بخەمە سەر هەموو باسێك لەو باسـانەی كە دانەر لەو كتێبەیدا ئاماژەی بۆ كردوە و تیشـكی خسـتوەتە سـەری، واتە ئەركم بریتی نییە لە وەرگێڕانی كتێبەكە، نە شـەرحكردنیشـی بەو واتای كە لەگەڵ هەموو بڕگەو ڕسـتەیەكی كتێبەكەدا بوەستم، و شەرحی بكەم، بەڵكو هەوڵ دەدەم لە ڕۆ شنایی قسـەكانی خۆیدا لە هەموو باس و تێبینی و ڕەخنەیەكیدا وانەیەكی لێ وەربگرم و پێشـكەشـی خوێنەری بەڕێزی بكەم، لەم بەشـەشـدا پوختە و پێناسەیەك دەربارەی كتێبەكە دەخەمەروو.

وشەی (زغل) لە زمانی عەرەبیدا كۆمەڵێك واتای هەیە، یەكێكیان بریتییە لە فێڵ و غەش و ساختە، كە دانەر لەو كتێبەیدا زەغەلی بەو مەعنا بەكار هێناوە، واتە: (الذهبي) دەیەوێت ئەو ساختە و هەڵانەی كە لە زانستەكاندا هەیە، ئەو شتە نەخوازراوانەی كە لە زانستەكان و ئەوانەدا هەیە كە سەرقاڵی ئەو زانستانەن، ئاشكرایان بكات و پەردەیان لەسەر هەڵماڵێت، ئەمەش وەكو یەكێك لە لێكۆڵەرەوانی كتێبەكە دەڵێت ئاماژەیەكی ناڕاستەوخۆی تێدایە بۆ پیشەكەی (الذهبي) كە ئەو ماوەیەك لەبەردەستی شێخ (ابن قايماز)ی باوكیدا لە پیشەی زەرەنگەری كاری كردووە، وەكو ئەوەی بڵێت من چۆن توانام هەیە ئاڵتوونی ڕەسەن و ساختە لەیەكتر جیابكەمەوە، ئاوها توانام هەیە زانستی ڕەسەن و زانستی ساختەش لەیەكتر جیا بكەمەوە.

چونكە ئەو هەوڵیداوە ئەو خەڵتە و بیدعەو هەڵانەی كە لە زانستەكانی قیرائات و تەجوید و تەفسیر و فەرموودە ومەزهەبە فیقهییەكان وزانستەكانی وەكو نەحو وزمان و أصول الفقه و علم المنطق و فەلسەفە و زانستەكانی الفرائض و إنشاء هۆنراوە وحیساب و شروط و وعظ و ئامۆژگاریدا هەیە دەریبخات و

پەنجە بخاتە سەر عەیب و لایەنە نامۆ و تاریکەکانی ئەو زانستانە بۆ ئەوەی فێرخوازانی زانست خۆیانی لێ بپارێزن.

کتێبەکە، یان نامیلکەکە ئەگەرچی دەوری بیست و پێنج لاپەڕەیەکە، بەڵام مەتنێکی پڕ لە زانیاری و بەسوودە، چونکە زادەی شارەزایی و ئەزموونی زانایەکی گەورەیە و لە قۆناغێکی پێشکەوتوو لەتەمەنیدا نووسیوێتی، تێیدا تیشکی خستووەتە سەر ئەو هەڵەو کەموکورتییانەی لە زا نا کان و لە زانستە باوو مەشهورە کانی سەردەمی خۆیدا بووە کە ئاماژەمان پێکرد.

بەڵام ئەوەی کە جێگای سەرسوڕمان و پرسیارە لەو کتێبەدا ئەوەیە کە (الذهبي) هەندێ ڕەخنەی لە (ابن تیمیة)ی مامۆستای خۆی گرتووە، لە کاتێکدا لە زۆر ێك لە کتێبە کانیدا بە ئەوپەڕی مەزنی و گەورەیی وسەرسام بوونەوە باسی کردووە و وتوویەتی ئەگەر لە نێوان ڕوکن و مەقامدا سوێند بدرێم سوێند دەخۆم هەرگیز زانای گەورەی وەکو ابن تیمیةم نەبینیوە ونەخۆیشی کەسی وەکو خۆی بینیوە،

جگە لەوەش ئەو تاكو مامۆســـتاكەی لە ژ یان دەرچووە لێی دانەبڕاوە و پاش مردنیشـــی قەســـیدەیەكی وەكو گریان لە وەســـف و مەدحیدا نووسیوە:

يا موت خذ من أردت أو فدع ** محوت رسم العلوم والورع
أخذت شيخ الإسلام وانفصمت ** عرى التقى واشتفى أولو البدع
غيبت بحرا مفسرا جبلا **** حبرا تقيا مجانب الشبع
فإن تحدث فمسلم ثقة ** وإن يناظر فصاحب اللمع

ئەوەش وای كردووە كە هەنـدێ لە لێكۆڵەرەوان نكۆڵی بكەن لە نســـبەتی كتێبەكە بۆ (الذهبي) و بڵێن ڕاســـت نییە كە ئەو كتێبەی نوو سیبێت، چونكە مەحاڵە الذهبي بەو هەمو ڕێزو خۆ شەویستییەی بۆ مامۆستاكەی هەیبووە قسەی پێ بكات!
هەندێكیش پاساویان بۆ هێناوەتەوە و وتوویانە مەبەستی ئەوە نەبووە و بە شێوەیەكی تر تەوجیهو لێكدانەوەی قسەكانیان كردووە.

به هەر حاڵ ئەو ڕەخنانەی که الذهبي له ابن تيمية ی گرتوه زیاتر ئەوەیە تۆمەتبـاری کردووە بەوەی که له گفتۆگۆدا تونـدوتیژە و موجـامەلەی نەیـارەکـانی نـاکـات و حەزی له خۆدەرخســتن و ســەرۆکایەتی و هه ندێ قســەی تر لەو شــێوە، بەڵام ئەوەی که دڵخۆشکەرە ئەوەیە أبو الفضل القونوي و محمد بن إبراهيم الشيباني وەڵامی هەموو ئەو ڕەخنانەی پێشەوا الذهبي یان داوەتەوە بەوەی که ژیاننامە و وته کانی ابن تيمية و هەڵســوکەوت و مامەڵەی له گەڵ قوتـابییەکـانی و لەگەڵ خەڵکی و لەگەڵ نەیـارەکـانیشــیـدا ئەوە دەســـلمێنن که ابن تيمية بەری بووە له هەموو جۆرە کیبرو لەخۆبایبونێك، بەڵام خاوەن عیززەت نەفسێکی زۆر بووە ڕەنگه ئەوە گومانی بۆ هەندێك دروســـت کردووە به کیبر تۆمەتباری بکەن. یان ئەوەی که لەگەڵ موبتەدیعه کا ندا مو نازەرەی دەکرد هه ندێ جار دەنگی بەرز دەکردەوە و دوا تر بـاســـی حیکمه تی دەنـگ بەرزکردنەوەکەشی دەکرد.

یان جاری وابوو به نەیارەکانی دەوت من ســێ ســـاڵ مۆڵەتتان پێ دەدەم که بیسەلمێنن وشەیەك لەوانەی من وتوومه پێچەوانەی قسەی پێشەوایانی سەلەفی سێ سەدە چاکەکه بێت و قسەی لەو جۆرە.

که پێیشـــی دەوترا قسـەت ڕەقه  پاســـاوی به ئایەت و فەرمووده دەهێنایەوه و دەفەرموو من دەزانم کەی و لەگەڵ کێ بەو  شێوه قسه دەکەم.

بەڵام ئەبێت ئەوه تێبینی بکرێت که ئەو ڕەخنانەی لەم کتێبه یدا هـاتووه بەرانبەر به ابن تيمية جیـاوازه لەوەی دەدرێته پـاڵی له (النصــيحة الذهبية)دا که گوایه بۆ ابن تيمية ی نووســیوه، چونکه بەدڵنیاییەوه ئەوه یان بوختانه و نه یاره کانی ا لذهبي و ابن تيمية دوای مردنی هەردوکیان ئەوه یان بۆ هەڵبەســتووه بۆی، بۆ زانینی ورده کاری ئەو بابەتەش دەتوانیت بگەڕێیتەوه بۆ کتێبی (التوضــيح الجلي في الرد على النصــيحة الذهبية المنحولة على الإمام الذهبي) له نووسینی محمد بن إبراهيم الشيباني.

سەبارەت به نکۆڵی کردنی هەندێ له زانایان لەوەی (زغل العلم) کتێبی الذهبي بێت بەهۆی ئەو ڕەخنانەی له مامۆســتاکەی گرتووه، ئەوەی که من پێی گەیشتم به گەڕانەوه بۆ چەندین لێکۆڵەر لەوانەی تەحقیقی ئەو کتێبەیان کردووه،

بەتایبەتی (محمد بن عبدالله أبو الفضـــل القونوي) کە دەڵێت حەوت دەستنووسی لە کتێبەکە دەستکەوتووە و دانەیەکیان لەبەرلین بووە وکتێبەکە هەنـدێکی بە خەتی دەســـتی الـذهبي خۆیەتی و هەندێکی بەخەتی قوتابییەکانێتی ئەوە دەیســـلمێنن کە (زغل العلم) نووسراوی (الذهبي) خۆیەتی. جگە لەوەش (ابن حجر العسقلاني) و (علم الدين الســـخاوي) و(أحمد بن طولون) کتێبەکە دەدەنە پاڵ (الذهبي) و دەڵێن کتێبی خۆیەتی.

هەروەها (أبو الفضـل القونوي) بەڵگەیەکی تر دەهێنیتەوە لەســەر ڕاســـتی نیســـبەتی کتێبەکە بۆ (ا لذهبي) ئەویش ئەوەیە (ابن قيم الجوز ية) بێزاری خۆی لەو کتێبە دەربڕیوە بە هۆی ئەو ڕەخنانەی کە دەر بارەی (ابن تيمية)ی مامۆســـتای هاتووە تێیدا و لە نونییە بەناوبانگەکەی خۆیدا وتوویەتی:

رامي البريءِ بدائهِ ومُصابهِ ... فعل المُباهتِ أوقح الحيوانِ
كمُعيرِّ للناس بالزغل الذي ... هو ضَربُهُ فاعجبْ لذا البهتانِ

کتێبەکە بەدیاریکراوی نازانرێت کەی نووسراوە، بەڵام ئەوانەی بەدواداچوونیان بۆ کردووە دەڵێن لە چەند ساڵی کۆتایی تەمەنی (ابن تیمیة)دا نووسراوە بەرەحمەت بێت، واتە لە نێوان ساڵەکانی (٧٢٠) بۆ (٧٢٦)ی کۆچی نووسراوە و لە نوسخەکانی دەستنووسەکەشدا دەردەکەویت کە (الذهبي) چەند جارێك دەستکاری و گۆڕانکاری لە مەتنەکەیدا کردووە.

کتێبەکە یەکەم جار لەلایەن (محمد زاهد الکوثري) تەحقیق کراوە کە زۆر هەڵوێستی دوور لە ئینساف و دادگەری بەرانبەر الذهبي وابن تیمیة هەبووەو لەوانەشە لە خۆشی ئەوەی کە ڕەخنە لەسەر ابن تیمیة تێدایە کتێبەکەی تەحقیق کردبێت!دووەم جاریش لەلایەن (محمد بن ناصر العجمي) تەحقیق کراوە، بەڵام پێم وایە چاکترین تەحقیق ئەوەی (أبو الفضل القونوي)یە کە لێرەدا بۆ نووسینی ئەم زنجیرەیە پشت بە ئەوەو تەحقیقەکەی العجمي دەبەستم.



# کورتەیەك لە ژیاننامەی دانەری کتێبەکە

ناوی (محمد بن أحمد بن عثمان بن قایماز)ی تورکمانی دیمەشقی شافیعی، ناسراو بە شمس الدین الذهبي، یەکێکە لە گەروە حافظ و زاناکانی سەردەمی خۆی و سەردەمانی دوای خۆیشی، لە ساڵی (٦٧٣)ی کۆچی لە دیمەشق لە دایکبووە،

لە قۆناغی منداڵیدا لە خیزانێکدا پەروەردە بوو کەسە نزیکەکانی ئەهلی عیلم بوون، تەنانەت پوری کە شیردەری بو خاوەن ئیجازە بوو لە قورئان و زانستی شەرعیدا، هەروەها خاڵی و مێردی پووری لە ئەهلی عیلم بوون و زانستی لێ وەردەگرتن.

هەر لەسەردەمی منداڵیدا بە باپیری کاریگەر بوو کە پیاوێکی دارتاش بوو و زۆر ئەهلی عیبادەت بوو، باوکیشی کە پیشەی زەرەنگەری هەبوو و حاڵی مادی زۆر باش بوو، گرنگی زۆری بە زانستی شەرعی دەدا، وەکو خۆ شەویست کردنی زانستیش لەلای کوڕەکەی هەندێ جار کە ئامادەی کۆڕەکانی (ابن عساکر) دەبوو شمس الدین الذهبي کوڕیشی لەگەڵ خۆی دەبرد، بۆیە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە قورئانی لەبەر کرد و،

کاتێك گەیشــتە تەمەنی پانزە ســاڵی لە زۆر ێك لە زانســتە شــەرعییەکان بە شــێوەیەکی باش شــارەزایی پەیدا کردبوو وخۆی دەڵێت لەو تەمەنەدا عیلمم لەلا زۆر مەزن بوو.

بۆ وەرگرتنی زانست گە شتی بۆ قاهیرەو ئیسکەندەرییە وچەندین شارو شوێنی تر کردووە ، بەڵام لەبەر ئەوەی باوکی پێی خۆش نەبوو لێی دووربکەوێتەوە و گەشتی زۆر بکات بۆیە زۆر دوور نەدەکەوتەوە و زۆریشی پێ نەدەچوو لەو دەڤەرانەی گەشتی بۆ دەکرد.

لە ســەرەتای بیســتەکانی تەمەنیدا لە زانســتی قیرائاتی قورئانیدا بەتەواوەتی شــارەزا بوو، تەنانەت لە الجامع الأموي لە دیمەشــق بازنەیەکی زانستی گەورەی لەو زانستەدا پێ سپێدرا.

الذهبي لە درێژایی ژیانیدا ســەرەڕای زۆریی مامۆســتاکانی بەڵام پەیوەندییەکی تۆکمە و تایبەت لەگەڵ ســێ مامۆســتادا هەبوو: أبو الحجاج المزي، تقي الدين ابن تيمية، علم الدين البرزالي، لە نێوان خۆیاندا جگە لە پەیوەندی مامۆستا و قوتابی،

هاوڕێ و خۆشەویستی یەکتریش بوون. بەڵام ئەو کاتەی الذهبي لە سەرەتای لاویدا بوو، ابن تيمية - وەکو بشار عواد معروف دەڵێت - کەسایەتی زانستی و ئیسلامی تەواو پێگەیشتبوو و زانایەکی ناودار بوو. بۆیە هیچ کات تاکو لە دونیا دەرچوو ئەو لێی دانەبڕاو ڕێزو وهەیبەتێکی زۆری لەدڵیدا هەبوو.

ڕێزو خۆشەویستی دوو هاوڕێکەی تریان واتە: البرزالي و المزي بە هەمان شێوە کەمتر نەبوو بۆ ابن تيمية ، بەڵکو ڕەنگە المزي کە لە بەتەمەنتریش بوو خۆشەویستی و سەرسام بوونی بە ابن تيمية لەوان زۆرتر بووە؟

شمس الدين الذهبي گەورەترین پلەوپۆ ستی زانستی سەردەمی خۆی وەرگرتووە، وەکو سەرۆکایەتی و مەشیەخەی هەندێ قوتابخانەی گەورەی ئەو سەردەمە کە لە ئا ستی زانکۆ ناودارەکانی ئەم سەردەمەی خۆماندا بووە، وەکو (دار الحديث النفيسية) و(دار الحديث التكيزية) و(تربة أم صالح) و شوێنی تر.

وەکو ئاماژەمان پێکرد مامۆســـتای گەلێك زۆر بووە، لەوانە: ابن دقيق العيد و الدمياطي و جمال الدين المزي و ابن تيمية، بەڵکو الصـــفدي لە کتێبی (أعيان العصرـــ وأعوان النصرـــ)دا وتوویەتی ژمارەیان دەگاتە ١٣٠٠ مامۆســـتا و خودی (الذهبي) هەڵســـاوە بە ئەژ مارکردنی د یارترینیان لە کتێبی: (معجم الشـــيوخ) و (المعجم المختص بالمحدثين) دا.

الذهبي لە ژ یانیدا خاوەن ڕێزو پلەو پایەی زۆر بووە لە لای خەڵکی و زانایانی ســـەردەمی خۆی دانیان بە زانســـت و لێهاتوویی ئەودا ناوە، بەڵکو لەدوای ســـەردەمی خۆیشـــی دەگێرنەوە زانایەکی گەورەی وەکو ابن حجر العســـقلاني ئاوی زەمزەمی بە نیەتی ئەوە خواردووەتەوە کە الله بیگەیەنێت بە پلەی الذهبي لە زانستدا.

الذهبي لە زانســـتە شـــەرعییەکاندا و بەتایبەتی لە فەرموودە و لە مێژوو و لە علم الرجال گەیشـــتبوو بە بەرزترین ئاســـت و پلەوپایە، مەتنی زانســـتی زۆری لەبەر بوو، کەســـێکی ڕاســـتگۆ و خاوەن کەسایەتی بەهێز بووە،

ئەوەی بەحەقی بزانیایە دەیکرد و لەپێناو هیچ شـــتێکدا تەنازولی نەدەکرد، کاتێك الحافظ المزي وەفاتی کرد جێگەکەی لە سەرۆکایەتی (دار الحديث الأشرفية) کە لایەنێکی زانســـتی گەورە و بەناوبانگ بوو، کەس نەبوو لە ئاســـتی الذهبي شـــایيســـتەی ســـەرۆکایەتی ئەو شـــوێنە بێت، جا لەو ســـەردەمە لەبەر ئەوەی دەســـەڵات لەلای ئەشـــعەرییەکان بووە، هیچ پلەو پایەیەکی زانســـتی وا گەورە بەکەس نەدەدرا ئەگەر ئەشـــعەری نەبێـت، بەڵام الـذهبي ڕازی نەبوو بە و شەیەکیش بۆ ڕازیکردنیان بڵێت ئە شعەریم و ئەو پلەو پایە ئیداری و زانستییە گەورە وەربگرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوە شدا ئەو لەگەڵ ابن تیمیةدا شـێوازی کارکردنی بۆ خزمەتی ئیسـلام جیاواز بوو، حەزی لە ڕرووبەڕووبوونەوەی دەسـەڵات نەبوو، هەمیشـە بە نەرمی و بەبێ وروژاندنی خەڵکی لە خۆی خەریکی وەرگرتن و بەخشینی زانستی شەرعی بوو، زۆربەی کاتەکانیشی بە نووسینی کتێب بە سەر دەبرد، بەڵکو جۆرێك لە گۆشەگیری پێوە دیار بوو کە دەرەنجامیش سەدان بەرگ کتێبی نووســی بۆ نموونە کتێبی (تاريخ الإسـلام) کە زیاتر لە ٥٠ بەرگە.

هەر لەبەر ئەو  نەرمی و دوورییەی لە ڕووداوەکانی سـەردەمی خۆی، دەبینین سەرەڕای سەرسام بوونی بە اين تيمية ی مامۆستای، هاوشێوەی ابن القيم و قوتابییەکانی تری شيخ الاسلام بەشدار نەبوو لە بەرگری کردن لێی و لەگەڵیدا زیندان نەکرا و پشکی لەو میحنەتە بەرنەکەوت. لەگەڵ ئەوەشـدا و لەبەر هەڵوێسـتی لە ابن تيمية لە چەندین پلەوپۆسـتی زانسـتی گەورە مەحروم کراو و لە سـەردەمی خۆی و لە سەردەمانی دوای خۆیشی ئە شاعیرە و  سۆفی و کە سانی تر بەوە تۆمەتباریان کرد کە لەژێر کاریگەری مامۆسـتاکەیدا بووە لە نووسینەکانیدا.

الذهبي کتێبی زۆری نووسـیوە و تا ئێسـتاش موسـوڵمانان لەسـەر ئاستی دنیا سوودی لێ دەبینن، بۆ نموونە: تاريخ الإسلام، سير أعلام النبلاء، ميزان الاعتدال، معرفة القراء الكبار، تلخيص المسـتدرك للحاكم، تذهيب التهذيب، المنتقى من منهاج السـنة النبوية، العلو للعلي الغفار...هتد.

ئینجا توانایەکی زۆری لە پوختەکردن و کورتکردنەوەی سەرچاوە زانستییە گەورەکاندا هەبوو، ئەوەش نەبێت تەنها کورتکردنەوە بێت و تەواو! بەڵکو بە ئیزافە و پەراویز و ڕوونکردنەوەو رادەربڕین پوختەو کورتکراوەکانی لە کتێبە ڕەسەنەکان بەسوودتر و سەرنج راکێشتر دەکرد.

تەنها بۆ نموونە کاتێك کتێبی (المستدرك على الصحيحين)ی الحاكم ی کورت کردەوە، حوکمیدا لە سەر نیوەی ئەو فەرموودانەی لەسەر بوخاری استدراك کرابوو کە حوکمێکی هەڵەیە و هاوڕا نەبوو لەگەڵیدا، تەنانەت وای حاڵ بەوە گەیشت ئەگەر وترا (صححه الحاكم) خوێنەر چاوەڕوانی ئەوەیە بزانە بەدوایدا نووسراوە (ووافقه الذهبي) بۆ ئەوەی وەربگیرێت!

شایانی باسە ئەم زانایە کە لە فروعدا شافیعی مەزهەرب بووە بە بێ دەمارگیری و وابەستە بوون بە هەموو ڕاو بۆچوونێکی مەزهەبەکە، لە عەقیدەو بیروباوەڕیدا سەلەفی بووە لە سەر مەزهەبی أحمد بن حنبل بووە و لەبەر ئەوەش کە قوتابی ابن تيمية بووە ئەوە کاریگەری زۆری لەسەری هەبووە و بەوە ناسراوە کە بەرگری لە عەقیدەی سەلەف کردووە و لە کتێبەکانیدا دژایەتی موعتەزیلە و

فەلاسیفە و موبتەدیعەکانی کردووە، بەو هۆیەش ئەشاعیرە حەزیان لێ نەکردووە و محمد زاهد الكوثري لە هاوچەرخەکاندا هێرشی دەکاتەسەر و دەڵێت کارێکی خراپی کردووە کە کتێبی (العلو)ی نوسیوە و خۆزگە ئەو کتیبەی هەر نەنووسیبا! ئەشاعیرە پێشەوا الذهبي تۆمەتبار دەکەن بەوەی کە بەهۆی خۆشەویستی زۆری و سەرسامبوونی بە ئیبنوتەیمییەی مامۆستای حوکمەکانی لەسەر ناودارانی مێژوو لە کتێبەکانیدا بەتایبەتی میزان الاعتدال کە یەکیکە لە مزنترین کتێبەکانی دەلێن کەوتووەتە ژێر کاریگەری ئەو و حوکمی ئەو لەسەر ئەو ناودارانە مەبەستیان زانایانی مەزهەبی ئەشعەرییە.

الذهبي حەوت ساڵ پێش وەفاتی بەهۆی نەخۆشییەکەوە بینایی چاوی لەدەستدا، لە تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا لە دیمەشق لە سالی ٧٤٨ وەفاتی کردووە. لە پاش خۆی کچێك و دو کوری بەجێهێشت، کچکەی ناوی (أمة العزيز) بوو، لە ژیانی باوکیدا هاوسەرگیری کرد و کوڕێکی بەناوی عبدالقادر هەبوو زانستی لە باپیری وەرگرت و ئیجازەی گێڕانەوەی کتێبی (تاريخ الاسلام) یشی لێ بەدەستهێنا.

دوو کوڕەکەشـــی ناویان (عبدالله و عبدالرحمن) بوو، لە ئەهلی عیلم بوون و ئیجازەی زۆرێك لە کتێبەکانی باوکیان وەرگرتبوو.

بۆ شـــارەزابوونی زیاتر دەربارەی ژیاننامە و بەرهەمەکان و زۆر پرسی تر دەربارەی الذهبي، دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ لێکۆڵینەوەکەی توێژەر دکتۆر بشـــار عواد معروف لە ســـەرەتای تەحقیقی بەرگی یەکەمی کتێبی (ســـير أعلام النبلاء) توێژینەوەیەکی تێروتەســـەلی زانستیانەی وردی لەو بارەوە کردووە.



# ڕەخنەگرتن لە قورئانخوێنان

یەکەم وێستگەو ڕاوەستانی شمس الدين الذهبي التركماني لە کتێبی (زغل العلم) دا لەگەڵ قورئانخوێنان و شارەزایانی عیلمی قیرائاتە، کە خۆیشی یەکێکە لە ناودارانی ئەو زانستە لەسەردەمی خۆیدا، بە وردی -و جیاواز لە سرو شتە نەرم ونیاینەکەی خۆی - بە توندی و زۆر بە توڕەیی هەڵە و پەڵە و سەرکێشییەکانیان دەستنیشان دەکات و بێزار بوونی خۆی لەسەری دەردەبڕێت.

لە دەسپێکی ڕەخنەکانی لە بەرانبەریاندا دەڵێت: قورئانخوێنان زێدەڕەوی زۆریان تێدایە، بێ ئەوەی پێویست بکات پرسەکانی تەجوید و شێوازی خوێندنەوەکان زۆر ورد دەکەنەوە، ئەوەندە گرنگی بە چۆنیەتی خوێندنی پیتەکانی قورئان دەدەن بیریان لەلای خشوع ومەعنا و وا تا کانی هەر نەماوە، بە بێزارییەکی زۆرەوە ڕوویان تێدەکات و دەڵێت: ئێوە پێتان وایە غەیری خۆتان نازانن بە جوانی قورئان بخوێننەوە، ئەی پێم بڵێن ئێوە چ کردەوەیەکتان بە قورئانەکەتان کرد!

ئێوە کردەوەکانتان چاك نییە و خوێندنەوەکەشـــتان زۆر قورس و ناخۆشە، خشوع و لە الله ترسانی پێوە دیار نییە!
دەپاڕێمەوە الله لە خەوی ڕیایی و نەفامی بێدارتان بکاتەوە!

بێگومان ئێستا لەسەردەمی خۆماندا ئەو دیاردە ناشەرعییانە زیاتر بوونە و لەلای زۆرێـك لە قورئـانخوێنـان قورئـان خوێنـدن بووەتە هۆکارێك بۆ خۆهەڵنان و توانای خۆ دەرخستن لە درێژی هەناسە و خوێندنی چەندین ئایەت بە یەك هەناســـە و دەنگ لەراندنەوە و بە ئاواز و ئەلحان خوییدن و تەقلید کردن و تەنانەت لە هەندێ جێگا ئەوەش پەیدا بووە کە قورئان لەگەڵ مۆســـیقا دەخوێیدرێت، جاری واش هەیە لەگەڵ گۆرانی بێژەکاندا پێکەوە لەســـەر شـــانۆ چالاکی هاوبەشـــیان هەیە، بەتایبەت ئەوانەی کە زۆر گرنگی بە مەقامات دەدەن هەســـت دەکەیت قورئانخوێندنەکەی لە گۆرانییەوە نزیکترە و هیچ گومانێك نییە لەوەی ئەو جۆرە قورئانخوێندنە حەرامە و هەر ئەوەشـــە کە پێشـــەوا الـذهبي بەو شـــێوە بێزار و توڕە کردوە لە قورئانخوێنانی سەردەمی خۆی.

ئینجا ڕوو دەکاتە ئەوانەی کە دەنگی خۆیان زۆر خۆش دەکەنەوە و بە شـــێوازێکی حەزین قورئـــان دەخوێنن، دەڵێـت ئەوانە ڕەنگە خەڵکی ســـوودیان لێ وەرگرێت و بەدەنگیان کاریگەر بێت، بەڵام هەر بەدوای ئەو قســـەدا، هێرشـــێکی تونـد دەکـاتە ســـەر ئەو قورئانخوێنانەی کە لەلای جەنازەو لە پرســـەکاندا قورئان دەخوێنن، دیارە لەســـەردەمی الذهبي بەهەمان حاڵی ئێســـتای موســـوڵمانان ئەو دیاردە ناشەرعی و ناشیرینە هەبووە کە کەسانێك بە قورئان کەسابەت بکەن و بیکەن بە هۆکارێك بۆ پەیدا کردنی بژێوی ڕۆژانەیان بەبێ گوێدان بەوەی کە ئەو کارە بیدعەیە و فرۆشتنە بۆ ئایەتەکانی الله یە بە نرخێکی هەرزان!

ئینجا ڕەخنەیەکی توند لەوانە دەگرێت کە لەســـەردەمی خۆیدا خەریکی زانســـتی قیرائاتی عەشرە و ســـەبعەن و دەڵێت زیاد لە پێویست خەریکی شێوازەکانی حەمزەو وەرشن!

هەر خەریکی ناســـك کردنی پیتی ڕا و قەڵەو کردنی پیتی لام و زێدەڕەوی لەو بابەتانە دەکەن و موســـوڵمان بەو هۆیەوە هیچ چێژ لە خوێندنەکەیان نابینن.

بێگومان لەم سـەردەمەی خۆیشـمان ئەوانەی بەو شـێوە دەخوێنن تووشی هەڵەی زانستی و شەرعی دەبن جگە لە مەترسی ڕووپامایی و حەزی خۆ دەرخســـتنیش دەڵێت: (إقرأ يارجل واعفنا من الغليظ و الترقيق) واتە: بخوێنە و واز لە دووبـارەکردنەوەی ئەو شـــێوازانە بهێنە.

ئینجا دەڵێت قورئانخوێنی وا هەیە کاتێك لە جێگەیەکدا قورئان دەخوێنیت، یان پێشـــنوێژی دەکات، هەموو توانایەکی خەرج دەکات لە هێنانی شـــێوازە نامۆکان و خۆ خەریك کردن لە گەڵ تەســـهیلی هەمزە و سەکتەکان و شێوازەکانی تری هەندێ ڕیوایەتی قیرائات و دەڵێت من باوکی فلانم و شارەزای هەر حەوت شێوازەکانی قیرائاتی قورئانم بمنا سن، جا لە کۆتایی ئەو بە شەدا الذهبي دەڵێت: چیت لێ بکەین کە باوکی فلانی؟
بەڵکو تۆ وەکو بەردی مەنجەنیق و قورقوشم لەسەر دڵمان قورسی.

له قسه‌کانی الذهبي لەو کتێبه یدا، دەربارەی قورئانخوێنان و شارەزایانی زانستی قیرائات که خۆیشی زانایەکی گەورە بووە لەو زانستەدا، دەردەکەوێت که:

١- بێزاری لە قورئانخوێنانی سەردەمی خۆی لەوە بووە، خوێندنەوەکەیان خشوع و لە الله ترسانی پێوە دیار نەبووە، خوێندنێکی بێ گیان و بێ تام بووە چونکە هەموو کێشەیەکیان لەوەدا بووە چۆن بەجوانی پیتەکان و شێوەکانی قیرائات دەربکەن و زێدەرەوی زۆریان لەو بارەوە کردووە؟

٢- قورئانخوێنان ڕیایی و ڕوپامایيان هەبووە و ئەو سەردەمه لەبەر ئەوەی تۆڕی کۆمەڵایەتی و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن نەبووە تا بەردەوام لێی دەربکەون، بۆیە ئەو جۆرە قورئان خوێنانە لە پرسە و سەرقەبران و لە هەندێ کۆڕ و کۆمەڵدا هەوڵیان داوە خۆیان دەربخەن و ڕیکلام بۆ خۆیان بکەن و لە قسەکانیدا وا دەردەکەوێت کەسانی خۆشەویست نەبوونە لەلای خەڵکی.

٣- ئەوەش لە قســـەكانی الذهبي وەدی دەكرێت كە هەندێ لە قورئانخوێنان بازرگانییان بە قورئانەوە كردووە و لە بۆنەكاندا بەپارە قورئانیان خوێندووە. كە ئەو دیاردەیە ئێســـتەش لەم ســـەردەمەی خۆماندا بە چڕی وەكو دیاردەیەكی ناشـــەرعی و ناشـــیرین بوونی هەیە.

٤- هەروەها ڕەخنەی لەوە گرتووە كە هەندێك لەوانە تەنها گرنگی بە پیتەكانی قورئان دەدەن و ســـنوور و واتاكانی پشـــتگوێ دەخەن، چۆن بڵێیت (حروف) ی قورئان بە جوانی دەردەبڕن بەڵام لە (حدود) ەكانی بێ ئاگان، خەریكی (تجوید)ن، بەڵام لە (توحید)دا لایانداوە و تێكەوتوون، ئەمەش كێشـــەی ئەو كاتەی ئەوو بەســـەد قات زیاتر كێشەی سەردەمی ئێمەشە.

خەریكە لە كوردســـتاندا نەوەیەك درووســـت دەبێت، قورئان بە جوانی دەخوێننەوە، بەڵام نازانن پێناســـە و واتای (لا إله الا الله) چییە، نە دەشزانن هەڵوەشێنەرەوەكان و مەرجەكانی چین، لەوانەشە لە زۆرێك لە قورئانخوێنانی ئێستای خۆمان،

بۆ نموونە دەربارەی (الولاء والبراء) پرســیار بكەیت یان تەنها ناوەكەی بیستبێت یان یەكەم جاری بێت ئەو وشە ببیسێت، جا وەرە قورئانخوێنێك ئەوە حاڵی عەقیدەی بێت ڕەفتار و مامەڵەی لەم ســەردەمە ئاڵۆز و غوربەتەی ئیســلامدا دەبێت چۆن بێت و چۆن بتوانێت خۆی لە لافاوی جاهیلییەت بپارێزێت كە ئەو ئەســڵەن جاهیلییەتی نەناسیوە و هەست بە هیچ كێشەیەك لەگەڵیدا ناكات!

نەوەیەك لە درووست بووندان وا تێگەیشتوون و تێگەیەندراون، ئەگەر بە تەرتیلێكی جوان قورئان بخوێنیتەوە و لە مەخارج و سیفاتی پیتەكاندا شارەزا ببێت، ئیتر هەر ئەوەندیان لەسەرە و بەوە بەهەشت مسۆگەر دەبێت، با لە عەقیدەش هیچ نەزانن و بكەونە جۆرەها لادان بەبێ ئەوەی بەخۆیشیان بزانن و لا حول ولا قوة إلا بالله.

٥- كارەســاتیش ئەوەیە ئەم هەڵە تێگەیشــتنە بەردەوام پەرەی پێ دەدرێــت و هــانی بەرەوپێشــچوونی دەدرێــت، تەنــانەت بــایەخی ئیجازەی قورئانیش تەواو كەم و كاڵ بووەتەوە، فێرخوازێكی زۆر ئیجازەیان بەسەنەدی نەپچڕاوە هەڵواسیوە و بەتەواوی نازانن قورئان بخوێننەو یان لە ڕووی زانســتییەوە بەســەر هەموو بابەتە كانی

تەجویددا زاڵ بن، زۆرێك لە مامۆستایانی ئەو زانستە لە ئەسڵی مەسەلەکە لایانداوە و هەندێکیان وەکو دەرگایەکی بژێوی لێی دەڕوانن و شتی زۆر ناخۆش لەو بارەوە دەگێڕنەوە بەداخەوە.

٦- لەبەر ئەو هەڵە ولادانە مەنهەجی و زانستیانەش کە باسم کرد و لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە زانستە زیانی بۆ کەس نییە و سوودی بۆ خاوەنەکە شی نییە! لە سەر هەموو ئاستەکاندا هانی بەردەوامبوونی ئەو جۆرە چالاکییە دەدرێت و بەردەوام ئاهەنگی دابەش کردنی ئیجازەو بانگهێشتکردنی قورئانخوێنان لە وڵاتانەوە بۆ کوردستان دەکرێت، چونکە قورئان لە ناوەڕۆکی خۆی خاڵی کراوەتەوە بەتایبەتی لایەنی عەقیدەو بیروباوەڕەکەی تەواو وەلاخراوە و کەسیش - إلا ما رحم ربي - هەست بە هیچ شتێکی نائاسایی ناکات لەو بارەوە، لەناو خودی ئەو ئاهەنگانەدا چەندین سەرپێچی زەقی ئەو قورئانە دەکرێت کە ئیجازە یان تێدا وەرگرتووە و بەتەمان بە هەموو پیتێکی پلەیەك لەبەهەشتدا بەرز ببنەوە، لەولاشەوە جەهلێکی تاڵ و ناخۆشیان بە دین و بە عەقیدەکەیان هەیە.

٧- بەداخەوە لە بواری  سیاسەتیسشدا ئەم مەسەلە بەکار دێت و هەر یەکەو هەر لایەنێك هەڵدەستێت دەیەوێت مەسـەلەی قورئان و تەجو ید و قیرا ئات بکات بە تە نافێك جۆرە ها  بابەت و  کاڵای ناشـــەرعی خۆی لەســـەری هەڵبخات و پەردە پۆشـــی زۆر شـــتی ناشەرعی خۆی پێ بکات.

کە بە ئاماژەی ناڕاستەوخۆ ئەم بوارە ترسناکە لە قسەکانی الذهبي دا ئەویش لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی ســەردەمەکاندا هەســتی پێدەکرێت.

هەروەها قورئانخوێنانی سەردەمی خۆمان زۆرێکیان دەبینین دەبتە پیـاوی زالمـان و دارودەســـتەی دوژمنـا نی  ئیســـلام، ڕێگەی مەشهوربوونیشیان زۆر جار بەسەر پردی ئەو سەرۆك و حکومەتانەدا تێدەپەڕێت کە  هەلی دونیاویســـتی ئەو قورئانخوێنانە دەقۆزنەوەو لەڕێگەی ئەوانەوە زۆر بەرنامەی دژ بە ئیسلام تێدەپەڕێنن.

بە کورتی قورئان ئێســـتا زیاتر لەســـەردەمی الذهبي تەنها بووەتە تەرتیل و تەجو ید و جوانخوێندنەوەو خوێندنەوەیەکی بێ روح و تەواو، بەڵکو لە جوانخوێندنەوەشدا زۆر کەموکورتی و هەڵەیان هەیە

و بڕوانامە و ئیجازە بەبێ شـایيسـتەبوون و بە ئیعتیباری نازانسـتی دابەش دەکرێت.

مایەی گر یانە کە دەبینیت ژمارەیەکی بەر چاو لە خوێنەران و فێرخوازان و ئەنـدامی سـەنتەر و قوتـابخـانەکـانی قورئـان لە کوردسـتاندا بەسـەر ئایەتەکانی تەوحید و عەقیدەدا تێدەپەڕن تەنها بیریان لەلای تەجوید و مەخاریج و سـیفاتە، خەتمە لە دوای خەتمە بە فێرخوازان تەواو دەکات بێ ئەوەی لە دە جێگای قورئاندا لە سەر بابەتەکانی عەقیدەو تەوحید بوەستێت لە کاتێکدا قورئان لە بنچینەدا بۆ ئەو مەبەستە دابەزیوە.

تە نانەت ئەو مامۆسـتا یانەی بۆ و تاردان لەو جۆرە ئاهەنگانە بانگهێشت دەکرێن، تەنها و تەنها جەخت لە سەر جوانخوێندنەوەی قورئان دەکەنەوە و با سی ئەوە ناکەن ئەگەر لەگەڵ ئەوەدا تەوحیدت تەواو نەبێت هەمو تەمەنت بۆ تەجوید و جوان خوێندنەوەی قورئان و قیرائات تەرخان بکەیت سوودی نییە.

٨- بێ گومان شمس الدين الذهبي لەو كتێبەیدا زیاتر مەبەستی بووە كە دیاردە پێچەوانەكان لەگەڵ شەرعدا دیاری بكات و زانستی ئیسلامی لەوەی ناوە زەغەل و فێڵ وهەڵە پاك بكرێتەوە و زیاتر مەبەستی ئەو جۆرانە بووە نەوەك حوكمێكی گشتی بەسەر قورئانخوێنان و زانایانی قیرائاتدا دابێت.

هەر وەكو چۆن ئەم دیاردە نامۆ و ناشەرعییانەی ئێمەش ئاماژەمان پیكرد لە كورد ستاندا حاڵی زۆرینەیە نەك ئەوەی هەموو ئەوانەی كە گرنگی بە تەجوید و زانستی قیرائات دەدەن لە كوردستاندا لەو جۆرە بن.

ئەوە بێ ئینسافییەكە من لێی بەریم ئەو قسە بكەم، بەڵكو تێیاندا هەیە زۆر بایەخ بەڕاسكردنەوەی عەقیدەی خۆ یان و عەقیدەی ئەوانەش دەدەن كە قورئانیان لەلا دەخوێنن و بەشێك نین لەم بەلارێبردنەی كە ئەمڕۆ لە كورستاندا دەگوزەرێت.



## تێبینییەکانی لەسەر زانستی فەرموودە

لە پاش ئەوەی کۆمەڵێك ڕەخنە و تێبینی تو ندی ئاراستەی قورئانخوێنانی سەردەمی خۆی کرد و خاڵە لاواز هەڵەکانی ئەو بوارەی دەستنیشان کرد، ئینجا ڕوو دەکاتە بەشێك لەوانەی سەرقاڵی زانستی فەرموودەن و پەردە لەسەر هەڵە و لادانەکانیان لە ڕاستەڕێگای سونەت لادەدات و پێیان دەڵێت:

زۆربەی ئەوانەی کە خەریکی سەماع و گوێگرتنی فەرموودەن هیچ خەمێکیان نییە ئەو فەرموودانەی دەیبیسن ڕاست بێت یان لاواز و هەڵبەستراو بێت، بەڵکو تاکە خەمێکیان تەنها ئەوەیە ئیجازەی سەماع بەدە ست بهێنن و شەهادەو بڕوانامەکانیان بە دەربڕینی ئەم سەردەمەی خوامان زیاد بکەن! هەروەها بۆ ئەوەی بڵێن ئیمە شێخ و مامۆستای زۆرمان هەیە.

ڕەخنە لەو جۆرە کەسانە دەگرێت و دەڵێت ئەوانە واتاو ئاکارەکانی ئەو فەرموودانەی دەیبیسن و دەیخوێننەوە لە خۆ یا ندا جێبەجێ ناکەن، بەڵکو لە کاتی گوێگرتن و دانیشتندا لەو بازنانە دەبینی دانیشتوان بە شتی ترەوە سەرقاڵن و تەنها ئەوەیان لەلا گرنگە لە کۆ تایی کۆڕەکەدا ئیجازەی خۆ یان وەربگرن و بڵێن ئیجازە مان لە فڵانە کتێبی فەرموودەدا وەرگرت.

ئینجا زیاتر بیریان لای ئەوەیە کە کتێبێکی فەرموودەیان بیست بتوانن بیڵێتەوە و فێرخوازانی زانست ڕوویان تێبکەن.

ئینجا الذهبي دەڵێت من گوتارم بۆ تۆ نییە ئەی ئەو فێرخوازەی بە دوای بڕوانامە و ئیجازەدا وێڵیت و کردەوە بە فەرموودەکان ناکەیت! بەڵکو گوتارم بۆ ئەو مامۆستایە کە وانەی فەرموودە دەڵێتەوە تۆیش وەکو من خۆت بێ بەش مەکە و وەکو من خۆت بەدبەخت و شوم مەکە، دەڵێت من شومم و ڕقم لە شوومەکانە!

بێگومان ئەم قسەیەش لە تواضع و خۆ بەکەمزانینی ئەو پێشەواوە سەرچاوە دەگرێت.

ئینجا دەڵێت ئەی فێراخوازی زانســت ئەگەر دەتەوێت ســوود لە زانســتی فەرموودە وەربگریت و لەجیاتی ئەوەی بچیتە لای هەندێ مامۆســتای ناشــارەزا و تەنها بڕوانامەی بێ ناوەڕۆك و زانســت بەدەست بهێنێت، پێویستە کتێبێکی کۆکردنەوەی هەردوو سەحیحی بوخاری موسلیم بخوێنیتەوە وەکو (الجمع بين الصحيحين) کە زیاتر لە کتێبێك بەو ناونیشــانەوە هەیە، هەروەها دەڵێت باشــترە بە وردی هەندێ کتێبی وەکو (أحكام عبدالحق) و(الضــياء) بخوێنیتەوە، کە ئەو کتێبــانە بۆ ســەردەمی ئێمە ڕەنگە قورس بن، بەڵام دەکرێت بگۆردرێن بە کتێبێکی بــاش و متمانە پێکراوای وەکو (عمدة الأحكام)ی عبدالغني المقدسي کە هەم فەرموودەو هەم فیقهـ لە یەك کاتدا..

ئەگینا دەڵێت چ ســوودێك دەبینی لەو کۆڕانەی فەرموودەی تێدا دەبیسیت و دانیشتوانی کۆڕەکە خەریکی قسەی خۆشن و دەنگی مناڵ و ژن و پێکەنین لەناو کۆڕەکەدا دەبیستریێت.

ئەوەی الذهبي باسی دەکات لە ڕاستیدا لە سەردەمی خۆیشماندا بوونی هەیە، بەڵام هێشتا بە تەواوی نەگەیشتووەتە لای خۆمان و من بە چــاوی خۆم ئەو کۆڕانەم لە هەنــدێ وڵاتی عەرەبی بینیوە لە

دەرەوەی کوردســـتان، شــەیخێك دانیشـــتووە و کۆمەڵێك قوتابی بەدەوریدا دانیشـــتوون و یەکیك بۆ نموونە ســـەحیحی بوخاری یان هەر کتێبێکی تر بە خێراییەکی زۆر دەخوێنێتەوە و گوێگران جاری واهەیە خەو یان لێ دەکەو یت و بگرە مامۆســـتاکەش خەوی لێ دەکەوێت و ئاگای لە مەجلیســـەکە نامێنیت و بەو شـــێوە لە چەند ڕۆژێك گوێگرتنی بەردەوامدا ســـەحیحی بوخاری و مســـلم و هەر کتێبێکی تر لە ماوەیەکی دیاری کراوی کەمدا تەواو دەکەن، چونکە جاری وا هەیە دە سعات بەسەر یەکەوە گوێ دەگرن و خوینەری ئەو کتێبانەش بە شێوەیەکی زۆر خێراو پەلە و نامۆ دەیخوێنیتەوە، مەگەر بۆ نوێژو نانخوارد لە کۆڕەکە دابڕێن، ئیتر بەو شـــێوە و بە ماوەیەکی کەم بۆ نموونە شەش کتێبەکانی فەرموودە و لەوانەش زیاتر دەبیسن و بە خەت و مۆری شەیخەکە ئیجازەیان پێ دەبەخشرێت، بەڵام ئایا جگە لەو ئیجازە کە ڕەنگە هەڵیواســـن یان خۆ یانی پی هەڵبنێن لە شـــوێناندا، ئایا فەرموودەکانیان لەبیر دەمێنێت کە بەو خێراییەو بەبێ شەرح و ڕوونکردنەوە بۆیان خوینراوەتەوە؟

بێگومان نەخێر، ئیتر هەم لە مامۆســـتا یان و هەم لە فێرخوازان هەیە ئەوە پیشـــەیـانە و بەبەردەوامی خەریکی ئەو گوێگرتن و

ئیجازەدان و ئیجازە وەرگرتنەن، بێ گومان ئەوەش سـوودێکی زۆری نابێت و جۆرێك لە ئیدمانی بێ سوود لە سەر ئەو حاڵەتە دروو ست دەبێت، جا الذهبي بێزاری و ڕەخنەی تو ندی خۆی بەرانبەر ئەو جۆرە حاڵەتە لە زانســـتی فەرموودەدا دەردەبڕ ێت و بە هەڵەیەکی زانستی گەورەی دەزانێت.

الذهبي ڕوو دەکاتە ئەو جۆرە مامۆســـتا و فێرخوازانە کە هەموو خەم و مەبەســـتێکیان هەر کۆکردنەوەی بڕوانامە وئیجازەیە و پێیان دەڵێت: (خلونا ! فقد بقينا ضـــحكة لأولى المعقولات ، يطنزون بنا ويقولون: هؤلاء أهل الحديث) واتە: لێمانگەڕێن! ئێوە ئێمەشـتان کرد بە گاڵتەجاڕ و بنێشـــتەخۆشـــەی دەمی خەڵکی پێمان دەڵێن ئەوانەن فەرموودەناسان!

ئینجا دەڵێت ئەگەر دەتەوێت بزانی زانســـتی فەرموودە چییە و لە کێ وەردەگیرێت بڕۆ لە سەرچاوەکانی خۆی وەریبگرە و ئینجا ناوی کۆمەڵێك لە ســـەرانی هاوەڵان و تابیعین و فەرموودەناســـانی گەورە دەبات و دەڵێت لە دوای ســـەدەی چوارەمی کۆچی ئەو زانســـتە بەراورد بە سەدەی سێیەم کەمی کرد و تەنانەت دەڵێت چەندین زانا لەســـەردەمانی پیشـــوودا بە زانســـتی فیقهو شـــەرع ناوبانگیان

دەرکردبوو، بەڵام لە فەرموودەدا لە فەرموودەناسـانی دوای خۆیان شـارەزاتر بوون، تاکو دەگاتە ئەوەی ناوی هەندی لە زانایان و فەرموودەناسـانی سـەردەمی خۆی دەهێنیت وەکو (ابن دقيق العيد) و(شرف الدين الدمياطي) و( جمال الدين بن الظاهري)، هەر وەها ناوی چەند کەسـێك دەبات لەوانەی بوونەتە بار بەسـەر زانسـتی فەرموودەوە و ئینجا سـوپاسـی الله دەکات لەسـەر ئەوەی لەو سـەردەمەی خۆیدا کەسـانێکی وەکو (الحافظ المزي) و(تقي الدين ابن تيمية) و(علم الدين البرزالي) و(ابن سيد الناس) و(تقى الدين السـبكي) و(الحافظ العلائي) و زانای تر بوونیان هەیە و خزمەتی زانستی فەرموودە دەکەن.

بەڵام لە پاش مردنی ابن تیمیةبەڕەحمەت بێت لە دەسـتنووسـێکی تری (زغل العلم)دا، هەندێ دەسـتکاری ئەو ناوانەی کردووە و لێی لابردوون و بۆی زیـاد کردوون، لەوانەشـە هۆکـاری ئەوە بێـت دەسـەڵاتی ئەو سـەردەمە زۆر توند بووە بەرانبەر ئەوانەی کە لە ابن تیمیة و لە فیکری ئەو نزیك بوونە و تەنانەت ئەم کتێبەشـی بە نهێنی دەستاودەستی پێدەکرا.

به کورتی پێشـــەوا الذهبي دەیەوێت بڵێت: تەماشـــای ئەوانە مەکە کە ناوی فەرمووودەناس و مامۆســـتای فەرمووودەیان لەخۆیان ناوە و شایەستەی نین، بەڵکو تەماشای ئەو زانا گەورەو فەرمووودەناسانەی پێشـــینان بکە کە پێشـــەنگی ئێمەن لە فەرمووودەناســـیدا و ڕێچکەی ئەوان بگرە.

الذهبي دەردەکەوێت لە قســـەکانیدا کە متمانەی زۆری بەزانایانی پێش سەردەمی خۆی هەیە و دەڵێت ئەگەر زانایانی سەردەمی خۆت لە بنەماکانی زانستی شەرعی لایاندا و ئاکاری زانایانیان هەڵنەگرت، بگەڕێرەوە سەر زانستی ڕه سەن لە لای زانایان و فەرمووودەنا سانی سەلەف و ئەوان بکە بە پێشەنگی خۆت و بیانکە بەپێوەر بۆ نا سینی زانایانی دوای ئەوان.

سەردەمانێك بوو ئەوانەی دەیانزانی زۆر بەبا شی لە کورد ستاندا قورئـــان بخوێنن زۆر ژمـــارەیەکی کەم بوون، هەرچەنـــد بەداخەوە ئێیســـتاش زۆربەی مامۆســـتایانی ئایینی و پێشـــنوێژەکان ســـورەتی الفاتحة بەتەواوی ناتوانن بخوێننەوە!

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی الحمدلله ئێستا ئەو کێشە تا ڕاددەیەك چارەسەر بووە و خەڵکانێکی زۆر بەجوانی و بە پێی بنە ما کانی تەجوید قورئان دەخوێنن، بەڵام بەداخەوە لەسەر حیسابی دوورکەوتنەوە لە ناوەڕۆکی قورئان و بایەخنەدان بە بواری عەقیدەو تەوحید، لە الله تعالی بپاڕێنەوە ئەگەر بەو جۆرەی پێشەوا الذهبي باسی دەکات و بەو شێوەی کە من لە هەندێ وڵات بینیومە نەیەتە کوردستان و مۆدێلی گەڕان بەدوای ئیجازەو مەجلبسی سەماعدا سەر هەڵنەدات کە زانستی فەرموودەش بکرێت بەزانستێکی بێگیان و بێ ناوەڕۆك لە کوردستا ندا، ئەگینا چۆن خەریکن قورئان لە جەوهەر و ناوەڕۆکەکەی خاڵی دەکەن و هەمووی لە تەجو ید و لە ڕواڵەتی دەربڕینی وشەکان و بەمەقامات خوێندن قەتیس دەکەن، فەرموودەش بەو دەردە دەبەن و لە جەوهەر و لە ناوەڕۆکەکەی خالی دەکەن، لە جیاتی ئەوەی پێشبڕکێ بۆ کارپێکردنی ناوەڕۆکەکەی وبەرجەستەکردنی عەقیدەو بیرو باوەڕەکەی درووست ببێت، پێشبڕکێ بۆ وەرگرتنی ئیجازەی بێ سوود و بڕوا نامەی بێ خێر سەرهەڵدەدات.

## ڕەخنەکانی لەسەر شوێنکەوتوانی مەزهەبی مالیکی

لەســەردەمی پێشــەوا (شــمس الدين الذهبي) دا، شــوێنکەوتنی مەزهەبە فیقهییەکان واقیعێکی بەرجەســتە بووە و تەواوی زانایان و خەلکیش بەســەر ئەو چوار ڕێڕەوەدا دابەش بوون، تەنانەت خودی دانەری ئەم کتێبەش کە لێرەدا ڕوونی دەکەینەوە لەســەر مەزهەبی شــافیعی پۆلێن کراوە، ئەگەرچی بەتەواوەتی وابەســتەی ڕێڕەوەکە نەبووە، جا لەم بەشـەی کتێبەکەیدا ڕوو دەکاتە قازی و دادوەرەکانی مەزهەبی مالیکی و پێیان دەڵێت:

مەزهەبی مالیکی کوڕی ئەنەس بەڕەحمەت بێت خێرو چاکەی تێدایە، بەڵام موفتی و قازییەکانی ئەو ڕێڕەوە پێویستە وریای خۆیان بن لەمەســەلەی تەکفیر و خوێن حەڵاڵکردنـدا، کە دیـارە لەو ســەردەمەی ئەودا ئەوان بە زێدەڕەوی لەو پرســەدا ناسراون و زێدەڕەوییەکەشــیان جۆرێك بووە لە لاســایی کردنەوەی پێشــینانی خۆیان، بۆیە پێیان دەڵێت قازی لەو مەسەلانەی پەیوەندی بە حوکمی ئیعدامەوە هەیە بە دەربڕینی ئەم سەردەمەی خۆمان،

پێویســـته زۆر وریا بێت و وردبێتەوە و تەقلیدی قازییەکانی پێش خۆی نەکات، نە ناچاریشــــه لە هەموو پرســـێکدا شـــوێنکەوتووی پێشـــەوا مالك یان هیچ پێشـــەوایەکی تر بێت، چونکە الله عزوجل پێویستی نەکردووە لەسـەر هیچ کەسـیك بە ڕەهایی شـوێنکەوتووی کەس ببێت جگە لە پێغەمبەر ﷺ، تەنانەت پێشـــەوا مالك بن أنس بەڕەحمەت بێت خۆی فەرموویەتی: هەموو کەســـێك لە وتەکانی وەردەگیرێت و ڕەتدەکرێتەوە، جگە لە خاوەنی ئەو گۆڕە نەبێت کە مەبەستی پێغەمبەرە ﷺ.

بەو شـــەرعناس و قازی و موفتییانە دەڵێت: ئەگەر ســـبەی لەبەرانبەر پەروەرگارتدا ڕاوەستایت و پرسیاری لێ کردی: لەسەر چ بنەمایەك خوێنی فلانە کەست حەڵاڵ کرد؟ ئەگەر بلێی شوێنکەوتووی ئەوانەی پێش خۆم بووم و لە حوکمەکەدا ڕێچکەی ئەوانم گرت. پێت دەفەرموێت: ئایا من وتوومە تۆ لە هەموو شتێکدا شوێنکەوتووی پێشـــەواکەت بە؟ لە پێغەمبەرەوە ﷺ جێگر بووە وەکو لە ســـەحیحی بوخاریدا هاتووە کە فەرموویەتی:

(أول ما يقضى بين الناس في الدماء) واتە: یەکەمین مە سەلە کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە نێوان خەڵکیدا حوکمی لەسەر دەدرێت و یەکلا دەکرێتەوە مەسەلەی خوێنە!

لە کۆتاییدا دوای ئەوەی داوایان لێ دەکات کوێرانە شوێن قسەی هیچ ئیمام و پێشەوایەك نەکەون و هەموو کار و حوکم و فەتوایەکیان بە پێی بەڵگەی شەرعی بێت، بە موفتی و قازییەکانی سەردەمی خۆی کە سەر بە مەزهەبی مالیک بوونە دەڵێت: بەڵێ ئەگەر ئەو کەسەی کێشەکەی هاتەبەردەستتان زندیق بوو، دوژمنی الله بوو، شایستەی حوکمی لەسێدارەدان بوو، ئەو حوکمەی بۆ دەربکەن، ئەگەریش هەرکێ شایستەی حوکمی لەسێدارەدان نەبوو، لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە دەرکردنی ئەو حوکمە بەدوور بگرن.

ئەوەی الذهبي باسی دەکات مەسەلەیەکە تایبەتە بە موفتی و قازییەکانی مەزهەبی مالیکی سەردەمی خۆیەوە کە بەوە ناسراون لە دەرکردنی حوکمی لە سێدارەدا ندا پەلە یان کردووە و زۆر ورد نەبوونەتەوە و ئەوەش وەکو تەقلیدێك بووە بۆ مەزهەبەکەیان و فەتوای زانایانی پێشینی خۆیان،

بۆیە ئەویش بەو شێوە ئامۆژگارییان دەکات و لە عاقیبەتی سووك سەیرکردنی مەسەلەیەکی وا پڕ لە مەترسی کە پەیوەندی بە خوێنی مرۆڤەکانەوە هەیە دەڵێت پێویستە زۆر وردبینەوە و لێکۆڵینەوە بکەن و تەنها بە حەقی خۆی نەبێت حوکمی کوشتن بۆ هیچ تاوانبارێك دەرنەکەن، چونکە ئەو سەردەمەو هەموو سەردەمێکیش دادوەر و قازی پێویستە لە هەموو حوکم و بڕیارێکیدا لەسەرخۆ بێت و مەبەستی بێت ڕەچاوی حەق بکات، حەقیش تەنها ئەوەیە کە الله عزوجل لە قورئاندا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە سوننەتەکەیدا بە حەقیان زانیوەو پێی ڕازی بوونە، مو سوڵمان چجای سەران و پێ شەوانیانیان هیچ یاسا و ڕێسا و ڕێبازێکی تر کە ناکۆك بێت لە گەڵ ئیسلامدا بەحەق نازانن و شوێنکەوتووی نابن.

چوار مەزهەبە فیقهییەکان ئەگەرچی دەدرێنە پاڵ یەکێك لەو چوار پێشەوا ناودارانە، (مالك وأبو حنيفة و الشافعي و أحمد) بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا زاناو ناودارەکانی سەر بە ئەو مەزهەبانە کە دوای دامەزرێنەر و پێشەوای یەکەمی ئەو مەزهەبە هاتوون، گۆڕانکاری گەورەو زۆریان لەناو مەزهەبەکەدا ئەنجام داوە و ناکۆکی و شیکردنەوەو وردەکاری زۆریان تێدا درووست بووە،

تاکو جارێك بە پێی وتەو بۆچوون و هەڵوێستی پێشەوای یەکەمی مەزهەبەکە بووە، دە جار پێچەوانەی وتەو بۆچوون و هەڵوێستەکانی ئەوان بووە، بۆیە کاتێك فەتواو ڕایەکی د یاری کراو ددرێتە پاڵ زانایەکی دیاریکراو لەو ڕێڕەوە فیقهییانە، ئەوە مەرج نییە ڕای پێشەوای یەکەمی مەزهەبەکە بێت. بەڵکو لە دوای ئەو درووست بووە و ناودارانی دوای پێشەوای یەکەم فەتوایان لەسەری داوە.

لە ڕاستیدا موسوڵمان داوای لێکراوە دینداری بە قال الله و بە قال الرسول ﷺ بکات، شەرح و ڕوونکردنەوەی زانایانیش بەتایبەتی زانایانی سەلەف دەخرێتە سەر سەرو سەرچاو تا ئەوەندەی کە لەگەڵ کیتاب و سوننەتدا پێچەوانە نەبێت، ئەگینا وەکو چوار پێشەوا ناودارەکانی مەزهەبە فیقهییەکان فەرموویانە فەرموودە وەردەگیرێت و قسەی ئەوان بەدیواردا دەدرێت، وەکو الذهبي خۆی لە کتێبی (سیر أعلام النبلاء)دا لە شافیعی بە ڕەحمەت بێت دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إذا صح الحديث فهو مذهبي وإذا صح الحديث، فاضربوا بقولي الحائط) بەڵام ئێمە قسەی ئەو پێشەوا بەڕێزانە بەدیواردا نادەین، بەڵکو بەڕێزەوە دەیگێڕینەوە و کاری پێ ناکەین ئەگەر پێچەوانەی فەرموودە بێت وکار بە فەرموودەکە دەکەین.

بۆیە بە قسەو فەرمانی ئەو پێشەوایانە خۆیان درووست نییە کەس بە ڕەهایی تەقلیدیان بکات، بەڵکو موسوڵمان بەدوای حەق و بەڵگەی کیتاب و سونнەتدا دەگەڕێت لە کوێ دەستی کەوت ئیشی پێ دەکات و خۆی بە شـێوەیەکی ڕەها بە مەزهەب و قسـەی هیچ کەسـێکەوە نابەستێتەوە.



## ڕەخنەکانی لە شوێنکەوتووانی مەزهەبی حەنەفی

لە دوای ئەوەی تێبینی و ڕەخنەکانی سەبارەت بە شوێنکەوتوانی مەزهەبی مالیکی خستەڕوو و بەتایبەتی ڕەخنەکانی ئاراستەی موفتی و قازییەکانی سەردەمی خۆی کرد، ئینجا دێتە سەر خستنەڕووی تێبینییەکانی لەسەر مەزهەبەکانی تر، بە پێی دەستنووسەکان هەندێ جیاوازی لە پێشخستن و پاشخستیاندا هەیە، دەڵێت:

١- فەقیهو شەرعناسەکانی سەر بە مەزهەبی ئەبو حەنیفە، وردبوونەوەو ژیریی و ڕاوبۆچوونی پەسەندیان هەیە، ئەگەر لە حیلەی شەرعی لە مەسەلەی سوو و بە تاڵ کردنی زەکات و دەنوکدانی ناو نوێژوو وکارکردن بەو مەسەلانەی کە لە فەرموودەدا پێچەوانەیان هاتووە ڕزگاریان بێت، ئەم قسانەی ذهبي ش لە ڕاستیدا ستایشێکە لە پۆشاکی زەم و سەرکۆنەکردندا نمایشی کردووە! چونکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەندێك لە فەقیهە حەنەفییەکانی سەردەمی خۆی حیلە شەرعی بۆ خەڵکی دەدۆزنەوە بۆ شەرعاندنی سوو خواردن و دەربازبوون لە زەکاتدان و کارکردن بە هەندێ

مەسەلە بە پێچەوانەی ئەوەی لە سوننەتدا هاتووە، بەداخەوە ئەمەش لە هەمو سـەردەمێکدا هەر هەیە و کەسـانیك بە ئایینەوە بازرگانی دەکەن و هەمیشە خەریکی شەرعاندنی کاری ناشەرعین بۆ خەڵکی.

٢- لێرەدا وەك دەبینین ذهبي بە مەدح و سـتایش دەسـتی بە باسکردنی زانا حەنەفییەکان کردووە، بەڵام یەکسەر بەدوایدا دەستی کردووە بە باسکردنی لادان و فێڵ و حیلە شەرعییەکان، ئەمە مەنهەج و ڕێبازی ئەوە لە زۆربەی کتێبەکانیدا، زۆر جار هەوڵی داوە نەیار و خەڵکی بە عام لە خۆی نەوروژێنێت و هیچ نەبێت پەیوەندییەکی لاوازیش بێـت لەگەڵ هەموانـدا بیبەسـتێتەوە، بەبی ئەوەی لە دینەکەشیدا تەنازول بدات، وەکو هەندێك دەڵێن ذهبي بەرانبەرەکەی بە لۆکە سەردەبڕێت!

ئەمەش خـاڵی جیـاوازی بوو لە نێوان خۆی و (ابن تيميـة)ی مامۆسـتا یدا، کە ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگرت هەمیشـە لە گەڵ نەیارەکانیدا توندە و سازش ناکات، بەرانبەرەکەی بریندار دەکات و دواتر کە دەیەوێت ساڕێژی برینەکەی بکات دیسان ئازاری دەدات وەکو هەندێك دەڵێن!

ذهبي پێی وابوو ئەگەر ابن تیمیة ی مامۆستای هەندێك لەو نەرمییەی بنوێنایە هەموان ملکەچی کەسایەتی و زانستەکەی دەبوون.

٣- لە کوردستانی لای خۆیشمان، ئیستا و لە ڕابردوویشدا چەند شێوازێکی فێڵ و حیلە شەرعی هەیە بە زەقی لە هەندێ بواردا لە لایەن کەسانی دین فرۆشەوە ئەنجام دەدرێت: وەکو حەڵاڵ کردنی ژن بۆ مێردەکەی کە سێ بەسێ تەڵاقی داوە ئەوەی کە لەناو خەڵکیدا بە (مارە بە جاش) ناودەبرێت، هەروەها چاککردنی جۆرەکانی تری تەڵاق بە فێڵ و بەپینەوپەڕۆ و ، شەرعاندنی پێدانی زەکات بە حیزب و کەناڵی ئاسمانی و ڕێکخراو بە بەهانەی سەهمی (في سبيل الله) کە ئەو موفتیانە خۆیان زۆر باش دەزانن ئەو کارەیان خۆخەڵەتاندن و لادانە لە ئایەت و فەرموودەکان و قسەی هەموو زانایان لەو بارەوە، هەروەها شەرعاندنی هەندێ جۆری مامەڵە کردن بەڕیبا، وەکو کڕینی سەیارە بە قیست سەرەڕای هەبوونی لایەنی سێیەم لە نێوان کڕیارو فرۆشیاردا کە بانکە و ئەوە مامەڵەکە حەرام دەکات و زۆر شێوازی تر وەکو زیادبوونی نرخەکە یا دانانی غەرامە لە کاتی

دواکەوتنی قیستەکە کە ئەمانە هەمووی حەرامە و کەچی بە فەتواش دەکرێت و دەشەرعینرێت!

کە بەداخەوە ئەوانەی ئەو کـارانە ئەنـجـام ئەدەن وەکـو حەنەفییەکانی زەمانی الذهبي، بەناو دینەوە قسـە ئەکەن و جوببەو عەمامەیان پۆشـیوە و جێگای باوەڕی ئەو خەڵکە داماوەن کە لە هەموو شـتێکدا شـارەزان وکەس لێیان ناباتەوە جگە لە دینەکەیاندا نەبێت داماون و هیچی لێ نازانن !

٤- لە درێژەی تێبینی و ڕەخنەکانی لە فوقەهای حەنەفی، شـمس الدین الذهبي دەڵێت: ئەوەی جێگەی گومانە وازی لێبێنە بۆ ئەوەی کە لێی دڵنیایت و گومانت لێ نییە، ئیحتیاتیش بۆ دینەکەت بکە و با هەموو خەمێکت هەر ئەوە نەبێت لە مەزهەبەکەت لا نەدەیت!

با فیقهەکەت بۆ دواڕۆژ بێت و بۆ بەرژەوەندی دونیا نەبێت، ئەگەر سـبەینێ لەبەر دەسـتی پەروەردگارتدا ڕاوەسـتایت و وتت لە پێناو تۆدا زانست فێربووم، پێت نەوترێت:

(كذبت إنما تعلمت ليقال عالم وقد قيل ثم يؤمر بك مســـحوبا إلى النار) واتە: پێت بوترێت درۆت کرد! بەڵکو بۆ ئەوە زانســـت فێر بووی پێت بوترێت زانایە و واوترا و ئینجا بەرەو دۆزەخ ڕابکێشرێیت.

بۆیە وا مەزانە مەزهەکەبەت چاکترین مەزهەبە و لەلای اللـە پەســەندترینە، چونکە نە تۆ و نە بەرانبەرەکەشــت هیچ بەڵگەیەکتان لەسەر ئەو قسەیەتان نییە، بەڵکو پێشەوایان لەسەر خێرو چاکەیەکی زۆرن، ئەگەر لە بۆچوونێکیا ندا بیپێکن دوو پاداشــتیان هەیە و نە شیپێکن یەك پادا شتیان هەر هەیە. بەوەش ئاماژە بۆ فەرموودەیەك دەکات لە ســەحیحی بوخاریدا کە دەفەرموێت: (إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثم أَ صابَ فله أَجْرَان، وإِذا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثم أَخْطَأَ فله أَجْرٌ)، بەڵام بێگومان وەکو ئەهلی عیلم باســیان کردووە ئەم فەرموودە بۆ کەسێکە هەموو ڕێگەکانی بەدواداچوونی گەیشتن بە حەق بگرێتەبەر و دوای ئەوە سەرکەوتوو نەبێت بە گەیشتن بە حەق، واتای ئەوە نییە هەرکێ هەڵسێت و لە دیندا قسە بکات پێکای دوو پاداشتە و نەیپێکا هەر یەك پاداشتی هەیە!

چونکە لەو حاڵەتەدا گومڕا و نەفعییەکانیش دەگرێتەوە!

٥- مەزهەبی ئەبو حەنیفە وەکو هەر مەزهەبێکی فیقهی تر مەعسوم نییە و کۆمەڵێـك هەڵە و نەپێکـانی تێـدایە و کـاتێـك کە حەق بۆ موســوڵمان بە بەڵگەی کیتـاب و ســوننەت دەرکەوت، ئیتر هیچ پا ساوێکی نییە بە بەهانەی ئەوەی وابە ستەی ئەو مەزهەبەیە کار بە سـوننەت و بە فەرموودەی سـەحیح نەکات، الله عزوجل لێیان قبوڵ ناکات واز لە سوننەت و فەرموودەی سەحیح بهێنین بۆ ڕاوبۆچوونی هیچ کەسـێك ئەگەر هاوەڵیش بێت، چجای زانایەك بێت کە دواجار مرۆڤە و قابیلی هەڵە کردنە.

بۆ نموونە کە بۆت دەرکەوت هیچ بەڵگەیەکی ســەحیح نییە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی لە بەرکەوتنی دەستی لە دەستی خیزانەکانی شــکاندبێت، یان لە هەموو نوێژێکی بەیانیدا قونوتی خوێندبێت، یان دەستی لە خواری ناوکەوە لە ناو نوێژدا گرتبێت و زۆر مەسەلەی تر، مادام بەڵگەی لەســەر نییە ئیتر ئەوە دادت نادات بڵێی لە مەزهەبی فڵانە ئیمامدا وایە منیش ئەبێت وا بکەم، ئەو ئیمامە خۆی فەرموویەتی: (إذا صح الحديث فهو مذهبي) واتە هەر مەسەلەیەك فەرموودەیەکی سەحیحی لە سەر بێت ئەوە مەزهەبی منە واز لە قسەی من بهێنن و بچنە سەر حوکمی فەرموودەکە!

دینداری بە ئایەت و بە فەرموودەی سـەحیح دەکرێت، هەروەها کرداری سـەلەفیش کە جێگر بێت و نیشـانەی ئەوە بێت لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیرابێت، نەك ئیجتیهادێکی خۆی بێت و هەڵەی تێدا کردبێت.

٦- بەڵام لێرەدا شایانی باسە بوترێت کە فەرموودەناسان جۆرێك لە یەك دەنگی لە نێوانیاندا هەیە لەسەر لاوازی ئەبوحەنیفە لە بواری فەرموودەدا، بۆیە ڕوو یان لێ وەرگێڕاوەو هیچیان لێ وەرنەگرتووە. جگە لەوەش ئەبو حەنیفە کێشەیەکی تری بووە سەبارەت بەوەی کە ئەهلی عیلم بە ئیرجائی فوقەها ناویان بردووە کە ئەبو حەنیفە عەمەل و کردەوەکانی لە ئەسڵی ئیمان دەرکردووە و بە مەرجێکی تەواوکەری داناوەو بەمەش جیاوازی لە نێوان ئەوو زانایانی سـەلەف و ئەهلی سـوننەت و جەماعەتدا درووسـت بووە، تا ئێسـتاش هەندێ لە فیرقەکان وەکو ماتوریدییەو فیرقەی تر بەڵگە لە قسـەی ئەبو حەنیفە دەهێننەوە بۆ بیدعەکەیان لە پێناسەی ئیماندا.

بەڵام سـەبارەت بەوەی کە هەندێ لەسـەلەف ئەو یان تەکفیر کردووە لەسەر ئەوەی باوەڕی بە خەلقی قورئان بووە، یان یان هەندێ

مەســـەلەی تر کە پێی تۆمەتبار دەکرێت، ئەوەیان زۆربەی زانایانی گەورەی ئیســـلام ڕەتیان کردووەتەوە، ڕەخنەیان لە ئەبوحەنیفە گرتووە بەڵێ، بەڵام تەکفیریان نەکردووە و (ابن تيمية)ش بەرەحمەت بێت لە کتێبی (رفع الملام عن الأئمة الأعلام) هیچ جۆرە تۆمەتێکی گەورە نـاداتە پـاڵ ئەبـوحەنـیـفە لە مەســـەلەی کـوفـر وئـیـمانـدا، لە هاوچەرخەکانیشـــدا سـلیمان العلوان کە زانایەکی ورد و بەتوانایە دەڵێت بەدواداچوونم بۆ ئەو تۆمە تانە کردووە کە دەخرێتە پاڵ أبو حنيفة بۆم دەرکەوتووە سێ جۆرن: جۆرێکیان ڕاست نین و ئەسڵیان نییە، جۆرێکیان ڕاستن وەکو سەنەد بەڵام تۆمەت نییە و کە لێی ورد دەبیتەوە هیچی تێدا نییە پشتی پێ ببەسـتریت بۆ تۆمەتبارکردنی ئەو لە دین و ئیمانیدا، جۆرێکیشیان دەڵێت وەکو سەنەد ڕاست و جێگیرە و لە هەندێ کتێبی وەکو (الســـنة)ی عبدالله ی کوڕی ئیمام ئەحمەد دا هاتووە بەڵام ئەو کەســـەی ئەوی تۆمەتبار کردووە خۆی هەڵە بووەو نەیپێکاوە.

الخطیب البغدادي لە کتێبی (تاریخ بغداد)دا لە پێشـــەوا أحمد دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (لم یصـــح عندنا أن أبا حنیفة کان یقول بخلق القرآن) واتە: لە ڕێگەیەکی ڕاســـتەوە پێمان نەگەیشـــتووە کە کە ئەبو حەنیفە باوەڕی وابووبێت کە قورئان مەخلوقە.

بە کورتی لە قســـەی زا نا یا ندا ئەوە دەدرەکەو ێت ئەبوحەنیفە هە ندێ هەڵە و نەپێکانی بووە لە مەســـــائیلی ئیما ندا، بەڵام کار بە تەکفیر ناگات با هەندێ لەسەلەفیش ئەو بۆچوونەیان بووبێت.

٧- جگە لە (إرجاء الفقهاء) کە ئا ماژە مان پێکرد، أبو حنیفة لە مەســـەلە کانی تردا لەســـەر عەقیدەی کیتاب و ســـوننەت بووە وبیروباوەڕی وەکو بیروباوەڕی سەلەف بووە:

* بـاوەڕی بە هەموو جۆرەکـانی تەوحیـد بووە و هەوڵی داوە بەهانەی هەموو شرکێك ببڕێتەوە.

* ناو و سیفەتەکان الله ی بەو شێوە کە لائیقە بە پەروەردگارەوە جێگر کردووە.

* بەرزی الله و بینینی لە ڕۆژی قیامەتدا جێگیر کردووە.

* ئیمانی بە هەر چوار پلەوپایەکەی قەدەر بووە: (العلم، والكتابة، والمشيئة، والخلق).

* بەڵام باوەڕی وابووە کە ئیمان تەنها بریتییە لە باوەڕهێنانی دڵ و قسەکردنی زمان، نە زیادیش دەکات و نەکەم دەکات، ئەنجامدەری تاوانی گەورەشی بە ئیماندراری ئیمان تەواو زانیوە.

لە کۆتاییشدا سەرنجتان بۆ تێبینییەکی زۆر گرنگ ڕادەکێشم ئەویش ئەوەیە هەرچی دەوترێت ئەوە مەزهەبی ئەبو حەنیفەیە -یان هەر مەزهەبێکی تر - مەرج نییە بۆچوونی خودی ئەبوحەنیفە و پێشەوایانی تری مەزهەبەکان بێت!

بەڵکو لەوانەیە بۆچوون وڕای فەقیهو زاناکانی ئەو مەزهەبانە بێت لە دوای مردنی پێشەوای یەکەمی مەزهەبەکە، بەڵام دواجار هەر لەسەر ئەو مەزهەبە پۆلێن کراوە.



# ڕەخنەکانی لە شوێنکەوتووانی مەزهەبی شافیعی

پێشـــەوا شـــمس الدین الذهبي بەرەحمەت بێت، وەکو پیشـــەی هەمیشـــەیی، تەنها رەخنە ناگرێت و چاوی بخاتە ســـەر خراپەکانی هیچ کەس و لایەنێك، بەڵکو پێش وریاییدان لە خراپەکانی، باســـی باشـــەکانی دەکات، بۆیە لێرەشـــدا ســـەبارەت بە زانایانی ســـەر بە مەزهەبی شافیعی سەردەمی خۆی دەڵێت:

١- زاناو فەقیهە شـــافیعییەکان ژیرتر و زاناترن لە زانایانی تر، چونکە بنەمای مەزهەبەکەیان لەســـەر شـــوێنکەوتنی فەرموودەی صـــحیح دامەزراوە و، پێشـــەواکەیان کە ئیمامی شـــافیعییە یەکێکە لەسەرانی فەرموودەناسان و فەزل و چاکەی گەلێك زۆرە،

٢- بۆیە ڕوو دەکاتە زانایانی ســـەر بە ئەو مەزهەبە و پێیان دەڵێت: ئەگەر ئێوە بۆ دینداری وخۆ ڕزگارکردن لە جەهل و نەفامی لەســـەر مەزهەبی ئەو پێشەوایەن ئەوا ئێوە کەوتوونەتە سەر خێروچاکەیەکی گەورەدا، بەڵام ئەگەر وەکو برایانتان لە فەقیهە دەســـت بەتاڵەکان کە

هەموو خەم و مەبە ستێکیان لە بەدە ستهێنانی پلەوپایەو بەڕێوەبردنی قوتابخانە و جل وبەرگی جواندا خۆی دەبینێتەوە، ئەوە زانســـتیکی بێ بەرەکەتە و نیەتێکی پاکی لەدواوە نییە، بەڵکو بە ڕوونی پێتان بڵێم ئەوە فرۆشتنی زانستە وخۆ تاوانبارکردنە و بێ ئاگاییە لە پەروەردگار و وەرگرتنی پاداشتی دونیاییە لەبری پاداشتی دواڕۆژ.

٣- لە سەردەمی پێشەوا الذهبي دا شافیعییەکان خاوەن دەسەڵات بوونە ودەستیان بەسەر قوتابخانە و مزگەوت و دادگا و هەموو جێگا گرنگەکاندا گرتبوو، تەنها کەســـانی ســـەربەخۆیان لەو شـــوێنانە دادەمەزراند، وەکو عەقیدەو بیروباوەڕیش ئە شعەری بوونە و لەگەڵ حەنابیلەدا لە جەنگێکی کراوەدا بوونە و بەهەمو شـــێوەیەك ئەوانیان چەو ساندوەتەوە بە تایبەتی بەرانبەر بە ابن تیمیة و شوێنکەوتووانی ئەوەی الله پێی ناخۆش بێت و لە شـــەرعدا جێگای نەبێتەوە بەرانبەریان کردویانە، لەو ســـەردەمەی الذهبي کە باســـی دەکات و بگرە لە هەر ســـەردەمێکدا دەســـەڵاتیان بە دەســـتەوە بووبێت، ئەگەر کە سێك لە فروعدا شافیعی و لە عەقیدە ئە شعەری نەبوایە لە هیچ مەنسەب و پلەو پایەیەکدا جێی نەدەبوویەوە،

مەگەر حەنەفی و مالیکی بوایە و لە عەقیدەدا ئەشعەری ئەوەیان حیسابی جیاواز بوو بەشداری پێدەکرا. ئەم حاڵەتەش خەڵکانێکی زۆری لە دەوریان کۆکردبوویە بە تەماحی دەستکەوتنی پۆست و مووچە و ئیشوکاری کارگێڕی، ئەوانەشی کە لەسەر ئەو پۆستانە بوون کەمترین لادانیان لە مەنهەجی ئەوان بکردایە لە کارەکە یان لادەبران و دەردەکران، بۆ نموونە قازییەك دانی خێری بە (ابن تيمية)دا بنایە یەکسەر لەسەر کارەکەی لادەبرا، بۆیە شافیعییەکان لەو سەردەمەی الذهبي دا زۆر دەمارگیربوونە و بێ رەحمانە بەرانبەر غەیری خۆیان ڕەفتاریان کردووە.

٤- لە درێژەی ئامۆژگارییەکانیدا بۆ شافیعییەکان - کە بە خۆیشی شافیعی بووە - ذهبي دەڵێت: ئەگەر خاوەنی پیشەیەك بیت بە عارەقەی نێو چەوانی خۆت نان بخۆیت و متواضع وخۆبەکەمزان بیت و بە زانستەوە خۆت بانەدەیت، یان خاوەن بازرگانییەك بیت، ئەوا تۆ لە زانایانی سەلەف دەچیت کە هەرگیز ئەم قوتابخانە و شوێنانەیان نەدیبوو کە پۆست و پلەو پایەی تێدایە و کاتێکیش داوایان لێ دەکرا ببن بە قازی لەو پلەوپۆستە هەڵدەهاتن و بە

زانستەکەیان عیبادەتی الله یان دەکرد و دەیانبەخشی بەخەڵك و بە پۆشاکێکی خام و بە پارەوە نانێك ڕازی دەبوون، ئینجا نموونەی (أبو إسحاق الشیرازي) و (محي الدین النووي) یان بۆ دەهینێتەوە کە دوو پێشەوای بەڕێزی شافیعی بوونە پێش سەردەمە خۆی و نموونەی کەسێکی هاوچەخیان بۆ دەهێنێتەوە کە ناوی (عبدالله بن خلیل)ە و داوایان لێ دەکات شوێنپێیان هەڵگرن و ئەو کەسایەتییانە بکەن بە پێشەنگی خۆیان.

٥- تورەیی الذهبي لە فەقیهە شافیعییەکانی سەردەمی خۆی لەوە سەرچاوە دەگرێت کە زۆرێك لەوان خەڵکی نەفعی بوونە و بەدوای پۆست و پلەو پایە وپارەوە وێڵ بوونە و تەنازولیان لە پێناویدا داوەو ئەوەی داوایان لێ کراوە نا شەرعیش بێت ئەنجامیان داوە، خۆیشی کە خاوەن کەسایەتییەکی بەڕێز و بەرز بووە و ئامادەنەبووە لە پێناو هیچ پلەوپۆستێکدا دابەزێت و کەرامەتی خۆی لەکەدار بکات، بەوەش نموونەیەکی جوانی لەو بارەوە بە موسوڵمانانی سەردەمی خۆی و تاکو ئێستاش پێشکەش کردووە.

٦- کێشــەو گرفتێکی تر لە کەســایەتی شــافیعییەکانی ســەردەمی خۆی ئــاشــکرا دەکــات و دەڵێــت: وریــابە لە کــاتی گفتوگۆ و لێوردبوونەوەدا بچیتە ناو مشتومڕو گومان دروستکردن وسەرخستنی نەفســی خۆتەوە با لەســەر حەقیش بیت و وریابە لە خۆبەزلزانین و سەر سام بوون بە کردەوەکانت، بەختەوەر خۆتی ئەگەر سەربە سەر لێی دەربچیت، لە دوای ئەم ئامۆژگاریانەی بۆ شــافیعییەکان (ابن تیمیة)ی مامۆستای بە نموونە دەهێنیتەوە و دەربارەی دەڵێت کە هیچ کە سێکی بە قەد ئەو زاناترو زاهیدتر و بێ نیازتر لە دونیا نەبینیوە و، ئینجا هەندێ قسە دەربارەی دەکات کە دەربڕینەکەی زۆر ڕوون نییە و بەرواڵەتی قسەکانی بێت ستایش و زەمی تێدا تیکەڵ کردووە و لە باسی شافیعییەکان دەردەچێت و سەبارەت بە ابن تیمیة دەڵێت:

٧- لە ژیانمدا چاوم بە کەســێك نەکەوتووە زاناتر و ژیرتر لەو پیاوەی کە پێی دەوترێت (ابن تیمیة)، دونیاشــی زۆر بەکەم گرتبوو بایەخی بە خواردن و پۆشــاك و ئافرەت نەدەدا، حەقبێژ بوو، بەوەی لە توانایدا بوو جیهادی دەکرد، ماندوو بووم و ســاڵانێکە هەرچەند ویســتم هەڵیســەنگێنم نەمتوانی، ئەوەی کە ئەوی دواخســت لەناو

خەڵکی میسرو شامدا و وای کرد ڕقیان لێی بێت و بەکەمی بزانن و بەدرۆی بخەنەوە و تەکفیری بکەن (لەدوای ئەم بڕگەیە قسەکانی الذهبي لێڵە و ڕوون نییە و ئەوانەی تەحقیقی کتێبەکەیان کردووە و خوێنەریش بە دو شێوە دەتوانێت لە قسەکانی تێبگات) دەڵێت: هۆکاری ئەو هەڵوێستانە بەرانبەر (ابن تیمیة) تەکەبور و بەخۆ موعجیب بوون و حەزی گەیشتن بە پلەو پایەو و بەکەمزانینیورە بووە، جا هەندێك دەڵێن مەبەستی (ابن تیمیة) بووە گوایە لەبەر ئەوەی ئەو سیفەتانەی تێدا بووە بۆیە هەڵوێستی خەڵکی لێی بەو شێوە بووە، کە بێگومان ژیاننامەی ئەو زانایە ئەو تۆمەتانەی بەتەواوی لێ دووردەخاتەوە و پێچەوانەکەی ڕاستە!

خودی الذهبي ش لە چەندین جێگەی کتێبەکانیدا باسی لە خۆبوردەیی و دونیانەویستی مامۆستاکەی کردووە، بۆیە ئەبێت هەر مەبەستی نەیارەکانی بووبێت کە بەهۆی تەکەبور و پلەو پایەکانیانەوە دژایەتی ابن تیمیة یان دەکرد،

الذهبي لە کۆتایی ئەو بڕگەیەش لە پاش ئەو دەربڕینە ناڕوونەی دووبارە ستایشی ابن تیمیة دەکات و دەڵێت:

(فقد قام عليه أناس ليسوا بأورع منه ولا أعلم منه و لا أزهد منه، بل يتجاوزون عن ذنوب أصحابهم آثام أصدقائهم، وما سلطهم الله عليه بتقواهم وجلالتهم بل بذنوبه، وما دفعه الله عنه وعن أتباعه أكثر، وما جرى عليهم إلا بعض ما يســتحقون فلا تكن في ريب من ذلك) وەكو دەبينين جارێكی تر ســتايشـــی دەكات بەڵام لە گەڵ ستايشەكەيدا ديسان ڕەخنەيەك ئارا ستەی مامۆ ستاكەی دەكات و دەڵێت نەيارانی ابن تيمية زاناتر و ديندارتر نەبوون لە ئەو، بەڵام بە هۆی گوناهو هەلەكانی ئەوان زاڵبوون بەســەريدا، بەڵام ئەوەی الله لەســەريانی لابرد لە خراپييەكانی ئەوانە زۆرتر بوو، واتە ئەگەر الله يارمەتيدەری ابن تيمية و هاوەڵانی نەبوايە نەيارەكانيان خراپتريشيان پێيان دەكرد!

دەڵێت ئەوەشــی كە بەســەر ابن تيمية و شــوێنكەوتوانيدا هات بە شێك بوو لەوەی كە شايستەی بوون، ئەمەش يەكێكە لەو قسانەی الذهبي كە ناكۆكە لەگەڵ قســەكانی خۆيدا لە زۆر جێگەی تر لە كتێبەكانيدا دەر بارەی ان تيمية و هەر ئەوەش وای كرد زۆر لە زانايان بڵێن ئەوە راست نييە و قسەی الذهبي نييە و بگرە هەنديكيان لە بنچينەوە خاوەندارێتی الذهبي بۆ كتێبی (زغل العلم)

رەتدەکەنەوە، بەهەر حاڵ بە شـــایەتی الذهبي خۆی ابن تیمیة بەو شـــێوە نەبووە و بەڵکو نموونەی خۆ بەکەمزانین و ئاکاری بەرز و دینداری وعیبادەت و بەرگریکردن بووە لە دین و لە ژینی خەڵکی.

٨- ئەگەر الذهبي بەو قسەی مەبەستی ئەوە بووبێت کە ابن تیمیة حەزی لە ســـەرۆکایەتی و دەرکەوتن بووە،، ئەوا ذهبي نەیپێکاوە و لەبەر ئەوەی ئەو یش مرۆڤە هەڵەی کردووە و دە کرێـت هەر بە قسەکانی خۆی وەڵام بدرێتەوە کە زۆرن، لەوانە: (ما رأیت فی العالم أکرم منه، ولا أفرغ منه عن الدینار والدرهم، ولا اظنه یدور في ذهنه) واتە: لە ناو هەموو خەڵکیدا، یان لە جیهاندا، کەســـم لە ابن تیمیة بەخشندەتر نەبینیوە، کەسیشم لەو بێ نیازتر نەبینیوە لە دیرهەم و دینار، وا دەزانم ئەو مەسەلە لە خەیاڵیشیدا بوونی نەبێت.

هەروەها ابن رجب الحنبلي بەڕەحمەت بێت دەگێڕێتەوە کە پێش ســاڵی ٦٩٠ك پۆســتی (قاضي قضــاة)ی بۆ پێشــنیار کراوەو ڕازی نەبووە وەریبگرێـت. بە خۆیشـــی ابن تیمیـة دەربـارەی خۆی فەرموویەتی: نازانم چۆن سوپا سی نیعمەتی زیندانیکردنم بکەم لای پەروەردگارم، من هیچم نییە ترسی ئەوەم بێت لێم وەربگرنەوە،

نە زەوی وزار و نە قوتابخانە و نە ماڵ و سامان و نە سەرۆکایەتی و نە پۆســـت وپلەو پایە. ئەوەشـــی کە دەوترێت بە چاوی کەمەوە ســـەیری هەندێ لە زانایانی کردووە ئەوە خودی الذهبي بەرگری لەوەی کردووەو وتوویەتی ئەوە نـابێـت وەکو ڕەخنە لێی بگیرێـت چونکە ئەو کەســـانی لارو گومڕای بەکەمزانیوە و لەگەڵ ئەوەشـــدا قسەی زانایان بەیەکتر نابێت باس بکرێت.

٩- هۆ کارێکی تریش ڕەنگە هەبێت بۆ رەخنەی الذهبي لە ابن تيمية ســـەرەڕای ئەو هەموو ڕێزو خۆشـــەویســـتییەی بۆی ئەویش مەســـەلەی قوتابییەکانی ابن تيمية بووە، چونکە ڕەفتاری توندی هەندێکیان قورس بە سەر مامۆستاکەیاندا دەشکایەوە و الذهبي ش ئەوەی پێ ناخۆش بوو، لەوانە عبدالرحمن العينوسي و ابن القيم و ابن كثير و عبدالله الإسكندري و صلاح الكتبي کە ئەمانە هەموویان گەنج بوون و زۆر ابن تيمية یان خۆشـــدەویســـت و بەرگرییان لێ دەکرد، عبدالرزاق الحلبي البزار دەربارەی قوتابییەکی ابن تيمية بەناوی عبدالله الإســکندري وتوویەتی: الله لێی خۆش بێت هاوەڵی ابن تيمية بوو و بە ڕەفتارەکانی بوو بە مایەی درووســـت بوونی فیتنە

و ئـاژاوەو هەروەهـا بوو بە هۆکـاری ئـازار و نـا خۆشـــی بۆ ماموٚستاکەشی.

واته: ذهبي لە هەڵســوکەوتی تو ندو زبری هە ندێ لە قو تابی و گەنجی حەماســی و خوێنگەرمی دەوروبەری ابن تيمية بەگلەیی و بەرِەخنەبووە و پێی وابووە کە ئەو رِەفتارانە زیانی بۆ موســوڵمانان و بۆ خودی ابن تيمية ش هەبووە.

تەنانەت ابن قيم الجوزية لە ناو قەسیدەی النونية دا لە دوو دێرِدا کە پێشتر ئاماژەم بۆ کردووە وا دیارە مەبەستی الذهبي بووە و لە سەر رِەخنەکانی لە ابن تيمية ی ماموٚستای سەرکۆنەی دەکات.

بە هەر حاڵ ابن تيمية سەرەرِای ئەوەی مرۆڤ بووە و قابیلی هەڵە بووە، بەڵام باوەرِم وایە لە کۆی ئەو خەســڵە تانەی کە هەیبووە لە رِووی زانست و ژیری و ئازایەتی وخۆراگری وعیبادەت و غیرەت و پشـــوو درێژی و ســـیفەتەکانی تری، الله أعلم لە درێژایی مێژووی ئیسلامدا حاڵەتێکی دەگمەنە و وێنە و هاوشیوەی یەکجار کەمە.

١٠- جـارێکی تر بگەڕێینەوە سـەر راوبۆچوونی الـذهبي و سـەبارەت بەو ڕەخنانەی کە لە فوقەهای شـافیعی دەیگرێت ئەوەیە لەسـەردەمی خۆیـدا حەزیـان بە دەسـەڵات و سـوڵتە بووە و دەمارگیرییان تێدابووە و لەسەر ئەوە لۆمەی کردوون و تانەی لێداون کە نەك هەر لەسەر ڕەفتارو مامەڵەی زانایانی سەلەف نەبوونە، بەڵکو توانجیـان لێ دەدات کە ئەوان پێچەوانەی پێشـینی خۆیـان لە شـافیعییەکان وەکو نەوەوی و شـیرازی ڕەفتار دەکەن و ئەسـڵی مەزهەبەکەیان دەستگرتنە بە سوننەت و واقیعی ئەو کاتەیان شتێکی ترە.

١١- مەزهەبی شـافیعی پشـکی شـێری بەرکەوتووە لە وەرگرتنی دەسەڵات لە درێژایی مێژووی ئیسلامدا و سەرەرای ئەوەی کە وەکو الذهبي دەڵێت باشـەیان زۆرە و ئەو لایەنانەیان نکۆڵی لی ناکرێت، بەڵام هاوکات زۆرێکیان نموونەی دادگەری و بێ فەرق و جیاوازی نەبوونە لە حوکمدا و دەسـەڵاتەکەیان زۆر جار بە شـێوەیەکی تەواو رەنگدانەوە نەبووە بۆ ڕەوشـتی جوان و عەقیدەی پاك و بێگەردی پێشەواکەیان پێشەوا شافیعی،

بەڵکو بە دژایەتی غەیری خۆیان ناسراون وهەروەها ناسراون بە سـیفەتی دە مارگیری و زۆربوونی لادانی عەقیدی بەهۆی ئەوەی زۆرێك لەلادەران لە عەقیدەی ئەهلی سـوننەت لە ناو ئەواندا بوونە و هەن، هەروەها دەمارگیری زۆریان بۆ مەزهەبەکەیان هەیە ئەوەش تەواو پێچەوانەی ئـاکـارو کەسـایەتی شـافیعییە کە لە کـاتی مونازەرەشـدا حەزی دەکرد حەق لەسـەر دەسـتی بەرانبەرەکەی دەرکەوێت و دەیفەرموو خۆزگەم دەخواسـت هەرچی عیلمم پێیە بڵاوبوایەتەوەو نەدرایەتە پاڵ من!

ئەو خەسڵەتە ناپەسەندانەیان هەمیشە ئەو جوانییەی لێڵ کردووە کە ئەو مەزهەبە لە پێشەوا محمد ی کوری إدریس ی شافیعی بۆی بە جێهاوە..

١٢- بەداخەوە لەم سـەردەمەی خۆیشـماندا بەهەمان شـێوەی سەردەمی شمس الدين الذهبي، ڕێژەیەکی زۆریان - نەك هەموویان- درێژەیان بە دەمارگیری و لە خۆباییبوون داوەو لە هەموو وڵاتێکدا کە بوونیان هەیە بوونە بە داروودەستەی زاڵمان و داپۆشەری گومرایی و لادانەکانیان، بە هەمان شێوەی سەردەمانی پێشوو،

ئێستاش لە زۆربەی وڵاتاندا کە سە دیارەکان و سەرانیان موفتی سەرۆکە زاڵم و گومراکانن و بەدلی ئەوان و چۆن داوایان لێ بکەن بەو شیوە فەتوا دەردەکەن!

١٣- ئەوەش کە با سکرا لە حاڵەتە نەخوازراوەکانی ئەو مەزهەبە، حاڵەتێکی گشتی نییە بڵێی هەموو شافیعییەکان بەو شێوەن، نەخێر نە لە ڕابردوودا و نە ئێستاش بە شێوەیکی ڕەها بەو شێوە نین، بەڵکو ئەمەی کە ذهبي لە (زغل العلم) ئا ماژەی پیکردووە و ئەوەش کە لێرەدا سەبارەت بە شافیعییەکانی ئەم سەردەمە خرایەروو، تەنها لایەنی تاریکی دیمەنەکەیە کە بەداخەوە واقیعێکی تاڵ وبینراوە و تا ئێستاش هەر بەردەوامە، بەڵام شافیعییەکان هەمیشە زانای گەورە و فەقیهی مەزن و موفەسیری بەتوانا و فەرموودە ناسی ئەلمەعی باش و گەورەیان تێدا هەڵکەوتووە و دینیان بە ماڵی دونیا نەفرۆشتووە بەڵکو خۆیشیان بە قوربانی کردووە و لەو هەڵەو دەمارگیریانەشیان بەری بوونە، خودی الذهبي کە لێرە ڕەخنەیان لێ دەگرێت نموونەیەکی باشە وبە خۆی شافیعی مەزهەب بووە،

پێش ئەویش النووي و دوای ئەویش ابن حجر العسقلاني - نەك الهیتمي- و سەدان زانای گەورەو بەڕێزی تر کە شافیعی بوونە و پێشەنگن و جێگای شانازین بۆ هەموو موسوڵمانێك،

لە کۆتاییشدا پێویستە ئەوە بوترێت هەرچی وەکو ڕەخنە دەگیرێت لە مەزهەبی شافیعی لە ڕەفتار و مامەڵە و لەکاتی حوکمرانی و لە عەقیدەو بیروباوەڕدا پەیوەندی بە خودی پێشەوا محمد بن إدریس الشافعی نیە و لە دوای ئەو درووست بووە، ئەگەرچی بە ناوی مەزهەبەکەی ئەو کراوە بەڵام بێگومان ئەو پێشەوا مەزنە لێی بەرییەو لە دوای خۆی شوێنکەوتوانی ئەنجامیان داوە.



# ڕاوبۆچوونی لەسەر مەزهەبی حەمبەلی

شێخ شمس الدين الذهبي لەگەڵ هەمو مەزهەبەکاندا وێستگەی تێروتەســەل و درێژی بووە بەراورد بە وەســتانی لەگەڵ مەزهەبی (أحمد بن حنبل) بەڕەحمەت بێت، کە بەدوو دێڕ و بە کورتی باســی ئەوانی بڕیوەتەوە، وەکو ئەوەی ڕەخنەو تێبینی زۆری نەبێـت لەسەریان، لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت ئەوان لەو سەردەمەدا بە دەستی شافیعی و ئەشاعیرەکانەوە چەوساونەتەوە و لە گۆڕەپانی سیاسی و زانســتیدا نامۆ دەرکەوتوون، ذهبي ش وەکو نەیتوانیوە بەڕاشــکاوی بەرگرییان لێ بکات، هاوکات نەشــیویســتوە قســەیەك بکات بچێتە گیرفانی نەیارەکانی ئەوانەوە، بە کورتی دەربارەیان دەڵێت: (وأما الحنابلة فعندهم علوم نافعة، وفيهم دين في الجملة، ولهم قلة حظ في الدنيا، والجهال يتكلمون في عقيدتهم ويرمونهم بالتجسيم، وبأنه يلزمهم، وهم بريئون من ذلك إلا النادر، والله يغفر لهم). ئەم چەند وشــەی شــێخی ذهبي بە چەند خاڵێکی پوخت روون دەکەینەوە و لە کۆتاییدا حاڵی حەنابیلەی ئەم سەردەمەی بۆ زیاد دەکەین:

١- فەرموویەتی حەنابیلە زانستی بە سوودیان لەلا دەست دەکەوێت، چونکە ئەوان گرنگی زۆر بە فەرموودەو زانستە کانی فەرموودەو گێڕانەوەی دەدەن، هەروەها بەوەش ناسراون کە داکۆکی لە عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەکەن ئەوەش دوای فەزڵ و چاکەی اللە تعالی لەگەڵیان بە کاریگەری (أحمد بن حنبل)ی پێشەوای مەزهەبەکە بووە، کە بەخۆی هەم فەرموودە ناس و زانا بووە بە علم الرجال وهەم فەقیهو شەرعناس و بایەخیکی زۆریشی بە عیلمی عەقیدە داوەو لەو پیناوەشدا تووشی ناخۆشی وزیندان و ئەشکەنجەی زۆر بووە.

تەنانەت ئەو کتێبانەش کە وەکو کتێبی فقە زانایانی ئەوان نووسیویانە، بۆ نموونە وەکو کتێبی (المغني) دەبینی جیاواز لە کتێبەکانی فقە لە مەزهەبەکانی تر زۆربەی کتێبەکە لەسەر بەڵگە و دەقی قورئان و سوننەت و کرداری سەلەف بونیات نراوە.

٢- هەروەها ئەوانی بە ئەهلی دین و بە خەلکی دیندار وەسـف کردووە و وتوویەتی بە شێوەیەکی گشتی حاڵیان بەو شێوەیە، وەکو ئاماژەیەك بۆ ئەوەی مەبەستی ئەوە نییە هەموو حەنابیلە بەو سیفەتە بن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی سیمای دینداری زاڵە بەسەریاندا.

٣-ئینجا وتوویەتی ئەوان ئەهلی دونیا و مەنسەب و پلەو پایە نین، ئەوەش قسەیەکی حەق و ڕاستە، حەمبەلییەکان بە شێوەیەکی گشتی و لە زۆربەی سـەردەمەکاندا لە سـولْتە و دەسـەڵات دووربوونە و پۆست و پلەو پایەی فەرمییان کەم بووە.

لە هەموو ئەوەشـدا بە پێشـەوای یەکەمی مەزهەبەکەیان کاریگەر بوون، چونکە ئەو لە دەسـەڵات نزیك نەدەبوویەوە بگرە کێشـەی گەورەشـی لەگەڵ دەسـەڵاتدا هەبوو بە هۆی هەندێ بابەتی عەقیدە وەکو مەسەلەی (خلق القرآن).

٤- لە بەشـــێکی تری قســـەکەیدا دەربارەی ئەوان ذهبي دەڵێت: جاهیلەکان و لە هەندێ لە نوســـخەکانی (زغل العلم)دا بە زاناکان کە مەبەســـتی پێیان ئەو جاهیلانەیە دەڵێت گومان لە عەقیدەی حەنبەلییەکان بۆ خەڵکی درووست دەکەن و ناووناتۆرەیان لێ دەنێن و پێیان دەڵێن (مجسمة)ن، واتە ئەوانەی الله وەکو جەستە و شێوەی مرۆڤ وێنا دەکەن، کە بێگومان ئەو قسـە ڕاسـتە و ئەوان لەو تۆمەتە بەرین، چونکە عەقیدەی ئەوان جێگیر کردنی ناوو سیفەتەکانی الله عزوجل ە بەو شـــێوەی کە لە قورئان و لە ســـوننەتدا هاتووە بەبێ شوبهاندن و پەکخستن و بەلاڕێ بردن و گۆڕینی بۆ واتای تر، جا کە نەیـارەکـانیـان لە جەهمییە و ئەشـــاعیرە و موعتەزیلە زۆربەی ســـیفەتەکان یان دەگۆڕن و یان تعطیل ی دەکەن و یان تأویل ی دەکەن و چەند سیفەتێك نەبێت سیفەتەکانی تری الله جیگیر ناکەن، بۆیە پەنایان بۆ پڕوپاگەندە ونا شیرین کردنی حەنابیلە برد و بەردەوام بە ئێســتاشــەوە ناووناتۆرەیان بۆ درووســت دەکەن و لەلای خەڵکی ناشـــیرینیان دەکەن و پێیان دەڵێن حەنابیلە موجەســـیمەکان و لە کاتیکدا خۆیشیان دەزانن ئەو تۆمەتە ڕاست نییە..

٥- الذهبي بەو تۆمەتانەی بۆ حەنابیلە درووســـت دەکرێت ڕازی نییە و ڕەتیدە کاتەوە و دەڵێت ئەوان بەرین لەو تۆمە تانە، مەگەر هەندێ حاڵەتی دەگمەن نەبێت، کە هەندێ زانای سەر ئەو مەزهەبە لە مەسەلەی الأسماء و الصفات هەڵەی کردووە و لە مەزهەبی ئەهلی ســـوننەت لایداوە و داوا دەکات الله تعالی لەو هەڵانەیان خۆش بێت.

٦- حەنابیلە ســـووربوونە لەســـەر مەزهەبی حۆیان و بە حوکمی ئەوەی کە هەم مەزهەبێکی فیقهی بووە و هاوکات مەزهەبێك بووە لە عەقیـدەدا بەبەڵگەی کیتـاب و ســـوننەت و گرنگیـدان بە وتەو تێگەیشـــتنی ســـەلەف، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا کە بەڵگەیـان بۆ دەرکەوتووە لە باســـێکی دیاریکراودا ڕاوبۆچوونی مەزهەبەکەیان تەواو نییە گەراونەتەوە بۆ سەر بەڵگەی فەرموودەو وازیان لە زاهیری مەزهەبی خۆیان هێناوە و ئەمەش لە کتێبیکی گرنگی وەکو (المغني) ڕەنگدانەوەی هەیە،

٧- شـــافیعییەکان کە وتمان دەســـەڵاتیان بەدەســـت بووە لەو سەردەمەدا، بە هەموو شێوەیەك حەنابیلەیان سەغڵەت کردووە وەکو بەشـــێکمان لەم زنجیرە باســـەدا پێشـــتر خســـتەروو، هەروەها لەگەڵ ناودارانی مەزهەبەکەشـــدا هەوڵیانداوە لە ڕیگەی پێدانی مووچە و پۆستی زانستی گەورە لە مەزهەبەکەیان پەشیمانیان بکەنەوە، الذهبي خۆی لە کتێبی ( تاريخ الإســـلام) دا بۆمان دەگێرێتەوە، أبو البقاء العكبري الحنبلي کە بەناوبانگترین ڕاڤەکاری دیوانی (أبو الطيب المتنبي) یە، دەڵێت شـــافیعییەکان هاتنە لام و بەڵێنی ئەوەیان پێدام ئەگەر بچمە سەر مەزهەبی شافیعی وتنەوەی وانەی زمان و (نحو)م پێ بســـپێرن لە (المدرســـة النظامية) کە لەو ســـەردەمەدا وەکو زانکۆیەکی گەورەی ئێستا بووە وانە وتنەوە لەو جێگە پلەو پایەیەکی زانستی وکۆمەڵایەتی گەورە بووە، بەڵام العكبري لە وەڵامدا سوێندی خواردووە و پێی وتوون: (لو أقمتموني وصـــببتم علي الذهب حتى أتواري به ما رجعتُ عن مذهبي)، واتە: ئەگەر ڕامبوەســـتێنن و ئـاڵتوونم بەســـەردا برێژن تـاکو دامـدەپوشـــن لە مەزهەبی خۆم ناگەڕێمەوە.

٨- ئەگەرچـی زۆر بە کەمـی بەڵام ڕووی داوە لە مـێـژوودا حەنابیلەش لە حوکمدا بەشدار بن، بەڵام بە پلەی یەکەم حەنەفییەکان و بە پلەی دووەم شـافیعییەکان و بە پلەی سـێیەم مالکییەکان لەناو دە سەڵاتدا بوونە، لە گەڵ تێبینی ئەوەی کە شوێنکەوتوانی مەزهەبی مالکی زۆر خۆ یان راگرت و چە ندین سـەدە یان تێپەڕا ند بە بێ تە نازول و لادان و چوونە ژێر کاریگەری موبتەدیعە کانەوە بەڵام دواجار ئەوانیش هاوشێوەی شافیعی و حەنەفییەکان چونە نێو یاری سیاسەت و ئەوەش نەبێت سیاسەتیکی شەرعی بەڵکو دژایەتی نەیار و دەمارگیری و لادانی عەقیدەو بیروباوەریشی تێکەوت.

٩- بەڵام حەنابیلە لە هەمویان لەو مەسەلدا پشودرێژتر بوون و، بۆ یەکەم جارە لەم سەردەمەدا بەو شێوە زەقەی ئێستا هەیە، بەشدار بن لە حوکم و دەسـەڵاتدا و لە هەڵەو لادان و فەسـادی حوکمڕانەکاندا هیچ نەبێت بەبێ دەنگ بوونیان لەسـەریان بەشـدار بن لەو هەموو لادانـانەی بەنـاوی ئەوانەوە دە کرێـت، ئەگەر چی لە زۆرێـك لە پرسـەکانی فیقهو عەقیدە هەر لەسـەر مەزهەبەکەی خۆیان ماون و بانگەواز بۆ سـوننەت دەکەن و دژایەتی بیدعەو زۆر کاری باشـی

تریش بەشـــێکە لە بەرنامەی کار یان، بەڵام لەبەر ئەوەی بوون بە دارودەســـتەی دەســـەڵاتێك کە هیچ بنە مایەکی عەقیدە نە ماوە نەیبەزێنیت بەتایبەت لەم ســـاڵانەی کۆتاییدا و ســـەرەڕای ئەوەش ئەوان هەر خۆ یان کەڕو بێ ئا گا کردووە و بەڵکو نەك هەر ئەوە، بەرگریشیان لێ دەکەن و هەمیشە شمشێری هەڕەشەیان بەناو دینەوە لەڕووی هەموو کەسێك هەڵکێشاوە بەیەك وشە نارەزایی بەرانبەر ئەو دەســـەڵاتدارانە دەربڕێت، بەوەش بەداخەوە گەیشـــتنەوە بە ســـێ مەزهەبەکەی تر لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و بوون بە ئامرازێك بە دەستیانەوە بۆ هەموو کارێکی دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان و وەکو ئەوەی ئەوان ئەرکیـان تەنهـا پینەو پەڕۆ وشـــەرعـانـدنی کـارە ناشەرعییەکانی ئەو دەسەڵاتە بێت!

١٠- یەکێکی تر لەو شـــەرمەزاریانەی حەنابیلەی ئەم ســـەردەمە پێشـــبڕکێی زانایان حەنەفی و شـــافیعی ســـەردەمی الذهبي و دوای سەردەمی ئەویشیان کردووە ئەوەیە نەك هەر هانی دەسەڵات دەدەن بۆ دەســـتگیرکردن و زیندانی کردنی نەیارانی مەزهەبەکەی خۆیان وەکو ئەوەی شـــافیعییەکان بە ابن تیمیة یان دەکرد، بەڵو حەنابیلەی ئەم ڕۆژگارە هەموو زانایەك ئەگەر لە خۆیشـــیان بێت و هاومەزهەب و هاووڵاتی و برای موســـوڵمانی خۆیشـــیان بێت، ئەگەر بەیەك وشـــە بەرانبەر ئەو دەســـەڵاتە بوەســـتیتەوە کە ئەمان خۆیان کردووە بە کۆڵەکەی ڕاگرتنی، یەکســـەر ئەگەر هانی دەســـەڵاتیش نەدەن بۆ دەســـتگیرکردنیان، بەیەك وشـــە نەبەرگرییان لێ دەکەن و نە داوای ئازاد کردنیان دەکەن لە کاتێکدا ئەوپەڕی دەســـەڵاتیان هەیە و لەبەرزترین پۆســـتەکانی حکومەتی ئەو وڵاتە بەشـــدارن، کە ئێســـتا ســـەدان زانای حەقبێژو بەڕێز و بەتوانا لە کونجی زیندانەکاندا و بەبەرچاوی زانایان مەزهەبی حەمبەلییەوە بە ناحەق ئەشـــکەنجە دەدرێن و دەکوژرێن، ڕۆڵی ئەو زانا حەمبەلییانەش لە جیتی بەرگری کردن لێیان، فەتوای دەســـتگیرکردنە، یان هەڵبژاردنی بێدەنگییەو لە پێناو پاراستنی پێگەو پلەو پۆستەکانیاندا هیچ هەڵوێستێکیان نییە!

بۆیە بێگومان ئەوانیش دواجار لەم سـەردەمەدا بە هەمان دەردو چارەنووسـی مەزهەبەکانی تر چوون و سـەرانی حەنابیلە لەم سەردەمەدا لەو چوارچێوە باسانەی کە بۆیان دیاری کراوە دەرناچن و بەو شێوەش لە ڕێبازی پێشەوا أحمد بن حنبل دوورکەوتوونەوە و لایاندا و ئێسـتا هاوشـێوەی سـێ مەزهەبەکەی تریان پێهاتووە لەسەردەمی الذهبي دا کاتێك کتێبی (زغل العلم)ی نووسیوە.

١١- پێشـەنگ و پێشـەواکانی ئەوان وەکو أحمد و البربهاري و أبو الوفا ابن عقيل و ابن تيمية و ابن القيم و ابن قدامة و تەنانەت محمد بن عبدالوهاب یش، ڕێبازیان گەلێك جیاواز بوو لە ڕێبازی ئەمانە و خۆیشـیان باش دەزانن لە هەندێك مەسـائیلی عەقیدەدا بەتایبەتی مەسـەلەی (الولاء والبراء) و مەسـەلەی (الحكم بغير ما أنزل الله) و رازی کردنی سـتەمکاران لە سـەر حیسـابی دین و بێ دەنگ بوون لە سەر زۆر لە لادانی سەرانی وڵاتەکەیان لە ئیسلام و چەندین مەسـەلەی تر یش لایانداوە و حاڵ بەوە گەیشـتووە لە وڵاتەکەیاندا ئەوەی الله پێی ناخۆشـە دەکرێت و ئەوان جگە لە ئم کردن! هیچ هەڵوێسـتێکیان نییە و تاکو دەمرن هەر سـوورن لەسـەر

بێ دە نگ بوون لەســـەر ناحەق و خزمەت کردنی راســـتەوخۆ و ناراستەوخۆ بەو دەسەڵاتدارانەی کە ساڵ بە ساڵ زیاتر لە ئیسلام دوور دەکەونەوەو ئێســـتاش گەیشـــتوونەتە ترۆپکی لادان، بەڵام سەرانی حەنابیلە هەر پیاوی دڵسۆزی وەلی ئەمرن و بە وشەیەکیش بەرانبەری ناوەستن، تەنانەت بە ئامۆژگارییەکیش، هەمیشەش ڕوو لە خەڵکی دەکەن و داوای گوێڕایەڵییان دەکەن بۆ وەلی ئەمر، زانای وا یان هەیە بەبەر چاوی هەموو دنیاوە دەڵێت: ئەگەر وەلی ئەمر هەموو ڕۆژێك لە بەرنامەیەکی راســـتەخۆدا ماوەی نیو ســـعات زینا بکات دروست نییە بە و شەیەك بەرانبەری بوەستێت و رەخنەی لێ بگرێت!، ئەمە جگە لەوەی کە هەرکێ دەنگی بەرز ببێتەوە بە قسەی حەق یان بە کەمترین ڕەخنە لەو دەسەڵاتدارانە یان باسی عەقیدەی تەوحید بکات بە شـــێوەیەك پەردە لەســـەر حەقیقەتی ئەو زاڵمانە لا بدات، یەکســـەر ڕاپێچی زیندان دەکرێت و ئەزانایانەش کە حەمبەلی مەزهەبن و لە دەســـەڵاتدا بەشـــدارن، نەك هەر ڕازین و بە هیچ ڕەخنەیەك ناگرن، بەڵکو زۆر جار بە فەتوای ئەوان ئەو کارانە و لەو کارانە خراپتریش ئەنجام دەدرێت،

١٢- بەڵام نـا بێـت ئەوە لە بیر بکرێـت، هەروەکو چۆن بۆ مەزهەبەکانی تریش ئەو قسـەمان کرد، بۆ مەزهەبی حەمبەلیش هەر دەبێـت ئەوە دوپـات بکرێتەوە، ئەویش ئەوەیە: ئەمەی بـاسـکرا سـە بارەت بە لادان و لە خراپییە کانی شـوێنکەوتوانی مەزهەبی حەمبەلی لەم سـەردەمەدا، تایبەتە بە بە چینێکی مەشـهور و دیاری کراوی ئەوان کە رەنگە زۆرینە بن، بەڵام لەولاشەوە زۆر زانای تریان هەیە کە خۆیان لە ڕۆشـنایی شـوهرەت بەدوور گرتووە و لەو هەموو لادان و گۆڕان ودابەزینەی زانـایـانی حەنـابیلە و سـەرانی دەسـەڵاتەکەشـیان بەرین و هاوبەش نین لەگەڵیاندا، جا ئەوانەیان پێیان بزانرێت و هەڵوێسـت بنوێنن جێگایان زیندانە و بێگومان زۆرێکیشان بێ دەنگییان هەڵبژاردووە و نەبەشدای ئەو شێواندن و لادانە دەکەن و نە بە ئاشکرایش دەتوانن لییان بەری بن.



## تێبینییەکانی لەسەر زانستی (النحو) و (علم اللغة)

لەم بەشەدا شمس الدين الذهبي بە ڕەحمەت بێت، باسی زانایانی بواری (النحو) دەکات و دەڵێت زانستەکەیان زانستێکی باشە و خەڵکی پێویستیان پێی هەیە، بەڵام دەڵێت کەسی شارەزا لە نەحو ئەگەر لە زانستی زمانی عەرەبیدا ڕۆبچێت و لە قورئان و لە سوننەتدا شارەزا نەبێت یان لەو بوارەدا بەکاری نەهێنێت، بێ ئیش و دەست بەتاڵ دادەنیشێت و کارەکەی وەکو کات کوشتن و یاریکردنە و الله لە ڕۆژی قیامەتدا مادام ئەوە حاڵی ئەو کەسە بێت پرسیاری زانستەکەی لێ ناکات، چونکە زانستەکەی نەبەستراوەتەوە بە قورئان و بە سوننەتەوە، کەواتە هاوشێوەی هەر زانستێکی تری دونیاییە وەکو زانستی پزیشکی و ژمێریاری و ئەندازیاری، نە لەسەری پاداشت دەدرێتەوە و نەلەسەری سزا دەدرێت، بە مەرجێك بەو زانستەی کە هەیەتی خۆی لە خەلکی بەباشتر نەزانێت و ترسی پەروەردگاری هەبێت و خۆی بەکەم بزانیت و کەسایەتی خۆی بپارێزێت. ئەمە هەموو ئەوەیە کە دەربارەی زمانەوانەکان وتوویەتی و دەکرێت بە کورتی چەند وانە و واتایەکی لێ دەربهێنین:

١- ڕێزمان و زانستی نەحو زانستێکی پێویستە و مەزنە ئەگەر بۆ تێگەیشتنی قورئان و سوننەت بەکاربێت، ئەگینا وەکو هەر زانستێکی دونیاییە و خاوەنەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەجرو پاداشـــتی لەســـەر وەرناگرێت.

٢- بایەخ و هەیبەتی زمانی عەرەبی بە قورئان و بەســـوننەتەوەیە، ئەگەر واش نەبوایە زمانێك دەبوو وەکو هەر زمانێکی تر.

٣- زمانی عەرەبی کلیلە بۆ تێگەیشـــتنی زانســـتەکانی ئیســـلام و لەسەرووی هەموویانەوە قورئان و سوننەت، بۆیە واجبی سەر شانی موسوڵمانانە فێری بن و بیپارێزن و غیرەتیان لەسەری هەبێت و لەبەر دینەکەیان لە هەموو زمانێك زیاتر خۆشـــیان بوێت و خۆیان فێری بکەن.

٤-هەندێ جار بەتایبەتی بۆ ئەو کەسـەی شـارەزا بێت لە زمانی عەرەبی وبەڵام لە دیندا شـارەزا نەبێت، لەوانەیە تووشـی کیبر و خۆبەزلزانن ببێت، بە تایبەتی کە دەبینێت ئەو تێدە گات و خەڵکی وەکو ئەو لەو زمانە تێناگەن، یان کاتێك خۆی دەزانێت ئیعراب بکات و ئەوان نایزانن، یان کاتێك کەسـێك بڕگەیەك دەخوێنێتەوە وهەڵە دەکات و ئەو بەتەواوی و بەبێ هەڵە دەیخوێنیتەوە، یان توانای نووسـین و دەربڕینی جوانی هەیە بەو زمانە، هەموو ئەوانە وایان لێ دەکات تووشی مەغروری بن و وابزانن کە ئەوان کەسانێکی زۆر پڕ بایەخن، ئەوەشـە سـیفەتێکی ناشـیرینە کە کەسێك بە بڕوانامە و بە زانسـتەوە تەکەبور پەیدا بکات و لە خۆی دەربچێت، مرۆڤ تاکو زاناتر بێت پێویسـتە زیاتر خۆی بەکەم بزانێت. ئیمامی شـافیعی فەرموویەتی:

كلـما أدبني الدهـر ... أراني نقص عقلي
وإذا ما أزددت علما ... زادني علما بجهلي

دوای ئەوە دەچێتە سەر باسی زانستی زمان (علم اللغة) و دەڵێت:
زمانناسەکان لەسەردەمی ئێمەدا تەواو کەم بوونە!

دەبینیت کەسێك شەرعناسە و زمانی شەرع نازانێت، یان خەلکی فیری قورئان دەکات و خۆیشـــی عەرەبی نازانێت، یان ســـەرقاڵی زانســـتی فەرموودەیە و بابەخی پێویســـت بە زمانی عەرەبی نادات، ئەوەش کەمتەرخەمی و نەفامییە، چونکە بایەخدان بە زمانی عەرەبی پێویستە بۆ ئەوەی لە گوتاری کیتاب و سوننەت تێبگەیت.

لەمەش بە کورتی دەتوانین بە چەنـد تێبینی و دەرەنجـامێـك لە قسەکانی الذهبي دەربچین:

١- گلەیی لە شەرعناس و مامۆستایانی قورئان و فەرموودەناسان دەکات کە وەکو پێویســـت بایەخ بە زمانی عەرەبی نادەن، ئەوەش هەڵەیە، چونکە هەرکێ تەواو شـــارەزای زمانی عەرەبی نەبێت واتە: تەواو شارەزای ئیسلام نییە و ناشبێت، ئیسلام ئەگەر بۆ نموونە بڵێین ژوورێکە ئەوا زمانی عەربی کلیلی ئەو ژوورەیە.

٢- هەڵەیەکی زانستی و مەنهەجی گەورەیە کە سێك دانیشێت بۆ فێرکردنی قورئان و خۆی لە واتاو وشــەکانی قورئان بە باشــی و بە شیکراوەیی تێنەگات، ئەمەش کارەساتێکە خۆم بە شەخسی شارەزای زۆر نموونەی ئەو بوارەم، زۆر یێك لەوانەی لەم ســاڵانەی دواییدا لەڕێگەی مامۆســتا بەخشــندەکان بە ئیجازەی قورئان ئیجازەیان وەرگرت، بوون بەخاوەن چەندین ئیجازەی قیرائەت و ڕیوایەتەکان و بگرە ئێستا ڕەنگە زۆر لەوانەی باسیان دەکەم عەشرەشیان هەبێت، بەڵام توانایان لە زمانی عەرەبیدا توانایەکی زۆر ســنوردار و لاوازە، وەکو پێویست تێناگەن لەواتای ئایەتەکان و تەوجیهی قیرائەتەکان و مەسەلەی وەقف و ئیبتیدا و زۆر باسی تر کە پیویستن بۆ مامۆستای قورئـان، تەنهـا بەســەیرکردنی موســحەف قیرائە لە دوای قیرائە ئیجازەی وەرگرتوە رەنگە ئەوەندەی عبدالفتاح القاضي ئیجازەی هەبێت و لە عەرەبیش تێناگات، ئەم حاڵەتەش جگە لە کورد ستان لە دونیادا بوونی نییە، بەڵام لە کوردســتان دەبینی ئیجازەی لە قیرائەتی نافع و ابن کثیر و أبو عمرو هەیە بە و بە عەرەبیش نەدەزانێت قسە بکـات و نە دوو دێڕ بنووســێـت و نە لە ڕێزمـان و قەواعیـد و بنەماکانیشی تێدەگات،

ئەوەش لە ڕاستیدا تاوانێکە بەرانبەر زانستی قیرائات و ناشیرینکردنە بۆی و بەزاندنە بۆ ئەو سنوورانەی کە زانایانی ئەو زانستە دیارییان کردووە، به هەمان شێوە زانستی فەرموودەناسیش، پێویستە ئەوانەی کە سەرقاڵی ئەو زانستە پیرۆزەن، لە زمانی عەرەبیدا زۆر شارەزا یی با شیان هەبێت، لە ڕا ستیشدا ئەوانەی کە خەریکی زانستی فەرموودەن لە کوردستاندا جیاواز لە فێرخوازانی زانستی قیرا ئات شارەزاترن لە زمانی عەرەبی و زۆرتر لە پیناو زانستدا خۆیان ماندوو دەکەن!

لەم بارەشەوە تویژینەوەیەکی بڵاوکراوەمان هەیە بەناونیشانی: (گرنگی زمانی عەرەبی بۆ تێگەیشتنی فەرموودە) هەوڵما نداوە ئەو گرنگییە بسەلمێنین و زۆر بەڵگەی زانستی و مێژوویی لەسەر ئەو بابەتە بخەینەڕوو.

٣- بەرگریکردن لە زمانی عەرەبی بەرگریکردنە لە ئیسلام، وەکو چۆن دژایەتیکردنیشی دژایەتییە بۆ ئیسلام، چونکە لاواز بوونی زمانی عەرەبی ڕێگرە لە تێگەیشتنی زانستە شەرعییەکان و دەرەنجام ڕێگرە لە تێگیە شتنی ئیسلام و بەو شێوەش نەوەیەك سەرهەڵدەدات بە ئینتیمای عاتیفی موسوڵمانە، بەڵام هیچ زانیارییەکی دەر بارەی پەروەردگاری و پێغەمبەکەی ﷺ و شەریعەتەکەی پێ نییە، ئەوەش ئامانجی نەیارانی ئیسلامە بۆیە هەمیشە و بە بەهانەی جۆراوجۆرەوە کار بۆ لاوازکردنی زمانی عەرەبی دەکەن، لە زۆر وڵاتانی عەرەبیدا بە هۆی پیاوانێك کە خۆیان بۆ دینەکەیان یەکلاکردبوویەوە وبەرگری سەختیان لەو زمانە کرد، پیلانی نەیارانی زمانی عەرەبی کە نەیاری ئیسلامیش بوون سەرینەگرت، بەڵام لە کوردستاندا ئەو پیلانە زۆر بەباشی سەریگرت، چونکە گۆڕەپان چۆڵ بوو بۆیان و ئەوانەی کە دەبوو بەرگری لەو زمانە بکەن، موجامەلەی عەلمانییەکانیان دەکرد و ئەوەندە پرۆژەو کاری سیاسی و بەرژەوەندی جۆراوجۆر و کاری هاوبەشیان پێکەوە هەبوو بایەخیان بەو پرسە هەر نەدەدا و نە بەلایشیدا دەچوون،

ئینجا خۆیشیان لە ڕووە قەومی و نەتەوایەتییەکەوە زۆر عەلمانییەکان باشتر نەبوون و جیاوازی زۆریان لەگەڵیاندا نەبوو وەکو عەرەب دەڵێن:(فاقد الشيء لا يعطيه)، بۆیە لە سایەی بێ هەڵوێستی ئەوان و ئەوانەی کە دەبوو هەست بە بەرپرسیارێتی بکەن، ئێستا نەوەیەك پێگەیشتووە هیچ لە زمانی عەرەبی نازانێت، ڕنگە شتێك لە زمانی ئینگلیزی بزانێت بەڵام لە زمانی عەرەبیدا کڵوڵە، ئەو کارەساتەش ئەگەر تاکە باشەیەکی هەبێت بۆ خودی ئەو بێ هەڵوێستانە بوو ئەویش ئەوەیە ئەو جۆرە کەسانە بە ئاسان بۆ هەر ئاراستەو ئینتیمایەکەی حیزبی و سیاسی ڕادەکێشرێن و قەناعەتیان پێ دەکرێت! چونکە زۆربەی ئەو نەوە لە گەنجان بەداخەوە لە عەقیدە و لە غەیری عەقیدەشدا - کورد واتەنی - سەریان تەقەی دێت و هەرچیان پێ بڵێی دەڵێن وایە ڕاستە!

بەڵام لەم بارەشەوە لە کوردستاندا ئاسۆیەکی ڕوون ومژدەی سەرهەڵدانی نەوەیەکی نوێ دوو بارە بەڕێوەیە کە بە وزەو گوڕو تینێکی باشەوە ڕوویان لە زانستەشەرعییەکان کردووە و ئاراستەیەکیش بەو بۆنەوە بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی - الحمدلله - درووست بووە کە مایەی دڵخۆشییە.

## دیدو بۆچوونی دەربارەی زانستی تەفسیر

پێشەوا شمس الدين الذهبي، دەربارەی تەفسیر و موفەسیرەکان دەڵێت: لەم ڕۆژگارەدا کەمن ئەوانەی بایەخ و گرنگی بە زانستی تەفسیر دەدەن، بەڵکو مامۆستایان و وانەبێژان دەچن تەفسیری (الفخر الرازي) دەخوێننەوە، لە ڕاستیشدا ئەو تەفسیرە کێشەو گرفت و گومانی زۆری لە خۆ گرتووە و درووست نییە بخوێنرێتەوەو ببیسترێت، چونکە خوێندنەوەی ئەو تەفسیرە دەبێتە مایەی سەرگەردانی و گومان و فێرخوازی زانست ئامانجی خۆی تێدا بەدیناکات، لە الله داوای سەلامەتی دەکەین.

لەم چەند دێڕەدا ذهبي گلەیی لە خەڵکی سەردەمی خۆی دەکات کە بە دەگمەن بایەخ بە زانستی تەفسیری ڕاستەقینەو حەق دەدەن، لەوەش خراپتر لە دیدی ئەو پێشەوا ئەوەیە هەندێك لە مامۆستایان دەچن بایەخ بە تەفسیری فەخری ڕازی ئەشعەری دەدەن و وەکو وانە دەیڵێنەوە کە لە ڕاستیدا ئەو تەفسیرە شایانی بایەخ پێدان نییە و تەفسیرێکی خراپە بەهۆی ئەو گومان و گرفتانەی کە درووستی دەکات.

لەدوای ور یایبدان لە تەفســیری ڕازی و باســکردنی ئەوەی مامۆ ستایان بەبێ زانست هەر ئەوەندە دەکەن کە کتێبێك هەلدەگرن و لێی دەخوێننەوە بۆ قوتابییە کانیان، دوای ئەوە دەڵێت: کێشــەی تەفسیر ئەوەیە موفە سسیرەکان دەچن تەما شای تەفسیرەکانی پێش خۆ یان دەکەن و کورتی دەکەنەوە و هە ندی لە بیرۆکە خراپە کانی خۆیشــیان ئەخزێننە نێو ئەو تەفســیرەوە کە لە ڕاســتیدا تەفســیر نییە تەنها کۆکردنەوەی قەولە کانە لەســەر ئەو ئایە تانەی کە تەفســیر دەکرێن.

هەروەها ڕەخنە لە موفەســیرانی قورئان دەگرێت بەوەی کە دەچن قەولێکی زۆر لەســەر یەك ئایەت کۆ دەکەنەوە لە کاتێکدا هەمووی لە ڕاســتیدا ســێ یان چوار قەولە بەڵام ئەوان زۆری دەکەنەوە، بەو درێژکردنەوەش حەق لەو نێوەندەدا ون دەبێت.

لە قسەکەی ئەوە دەردەکەوێت کە مەبەستی لەو رەخنانەی ئەوەیە حەق و باتڵ لە قســەی ڕاڤەکارانی قورئاندا تێکەڵ دەبێت، لەوەش خراپتر ئەوانەن کە لە تەفســیرە خراپ و ئاخنراوە کان بە بیدعە و گومڕایی زانیاری دەگوێزنەوە.

کەواتە زۆرێك لە تەفسیرەکان سوودیان نییە و زیادەن و زیانیشیان هەیە، چونکە دانەرەکـانیـان بیـدعەکـانی خۆیـان دەخەنە نێو ئەو ئەقوالانەی کە باســـی دەکەن دەر بارەی تەفســـیری ئایەتە کان، بەداخەوە لە کوردســـتانیش هەمان ئەو حاڵەتەی کە ذهبي وریایی دەر بارەی داوە بوونی هەیە، کەســـانێك دەچن لە تەفســـیرە کان ئەقوالە کان وەردەگێرنە ســـەر زمانی کوردی و لە کوێیش بواری بۆ رەخسا گوایە ئەویش موفەسسیرە و قورئان تەفسیر دەکات، دەچێت بیـدعەو گومڕایی و لادانەکـانی خۆی دەخزێنیتە نێو تەفســـیری ئایەتە کانەوە، لە ڕاســـتیداهەرکەســـێك لە کوردســـتا ندا خاوەنی عەقیدەیەکی پاك نەبێت و ئەهلی عیلم نەبێت و لەســـەر مەنهەجی ئەهلی سوننەت نەبێت، دروست نییە تەفسیری بخوێنرێتەوە وچونکە بە بێ زیان لە خویندنەوەی دەرناچێت، ئینجا ئەگەر لێی وردبیتەوە دەبینیت ئەوە تەفسیر نییە، بەڵکو تەنها وەرگێڕانێکە بۆ قسەو قەول و تێگەیشـــتنی موفەســـیرانی تر، ئینجا بەهۆی ئەوەی هەندێ لەوانە گومڕان و لە زمانی خۆیان و تۆمارکراوەکانی خۆیانەوە بە ئاســـانی دەتوانیت گومڕاییان بســـەلمێنیت، بۆیە درووســـت نییە نە تەفســـیریان بخوێنرێتەوە و نە بفرۆشرێت لە کتێبخانەکاندا،

چونکە ئەو کارە جۆرێکە لە یارمەتیدان بۆ بڵاوکردنەوەی بیدعەو گومڕایی و جۆرێکە لە ڕەواجدان بە فیکری مونحەریف ولادەری ئەو جۆرە کەســــایەتیيانە.الله تعالى فەرموويەتی: (وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ.)

لە قســـە کانی ا لذهبي ش ئەوە وەردەگیر ێت - وەکو یەکێك لە ڕاڤەکارانی کتێبی (زغل العلم )دەڵێت - هەندێ لە موفوســـیرەکان دەچن قســـەیەکی زۆر دەر بارەی یەك ئایەت، یان چە ند ئایەتێك دەنووسن، ئەوەش بریتییە لە بەتال کردنی زانستێکی تری دەرەکی لە تەفسیر لە ناو زاندستی تەفسیردا، بۆ نموونە دەچێت با سیکی زۆری فیقهوشـــەرع لە تەفســـیری ئایەتەکاندا باس دەکات وەکو ئەوەی کتێبێکی فیقهی بێت لە کاتێکدا خۆی تەفســـیرە، یان بەتاڵ کردنی هەر بابەت و زانســـتێکی تر لە ناو تەفســـیرەکەدا، ذهبي ئەوانە بە کارێکی باش و بەسوود نازانێت.

لە ڕابردوو و لە ئێســـتاشـــدا تەفســـیری قورئان گەلێك زۆرە، بەڵام پێدەچێت:

* تەفسیرەکەی پێشەوا الطبري (جامع البيان عن تأويل آي القرآن) لە چاکترینیان بێت،

* هەروەها تەفسیری ابن كثير (تفسير القرآن العظيم).
* تەفسیری البغوي (معالم التنزيل في تفسير القرآن)
* تەفسیری القرطبي (الجامع لأحكام القرآن) .
* تەفسیری (فتح القدير)ی محمد بن علي الشوكاني.
* تەفسیری (أضواء البيان)ی محمد الأمين الشنقيطي.
*تەفسیری عبدالرحمن السعدي (تيسير الكريم الرحمن).
* (التفسير الميسر) لە نووسینی دەستەیەك لە زانایان.

هەروەها زۆر تەفسیری تر هەیە بەکەڵك و بەسوودن موسوڵمان دەتوانێت سوودیان لێ وەربگرێت و تەفسیریش نییە هیچ هەڵەو نەپێکان و ئیسرائیلیات وفەرموودەی لاوازی تێدا نەبێت، بۆیە ڕەچاوی هەندی مەسەلە بکە لەوانە:

- زۆرێك لە کتێبەکانی تەفسیر حەق و باتڵ و صحيح و ضعيف ی تێدا کۆبووەتەوە و دەبێت بە ئەوپەڕی وریاییەوە لە تەفسیرەکان وەربگریت، زانایان فەرموویانە: «ثلاثة كتب ليس لها أصول: التَّفسير والملاحم والمغازي».

- سەرەتا باشترە تەنها واتای وشەکانی قورئان و هۆکاری دابەزینی ئایەت و سورەتەکان و هەندی تەفسیری کورت و پوخت وەکو تەفسیری الجلالین و التفسیر المیسر بخوێنرێتەوە.

- تەنها لە تەفسیرە سەرەکییە ناودارەکان و تەزکیە کراوەکان لەلایەن ئەهلی عیلمەوە زانیاری و زانست وەربگیرێت. چونکە کتێبی تەفسیر گەلێك زۆرن و خوینەر هەرگیز ناتوانێت هەمووی بخوێنێتەوە، تەمەنی تەواو دەبێت کتێبی تەفسیر تەواو نابن.

- لە تەفسیری ئەهلی بیدەع بە هەموو شێوەیەك خۆت بپارێزە، تەفسیری موعتەزیلە و ئەشاعیرە و قورئانی و عەقلانییە هاوچەرخەکان و هەروەها لە تەفسیری هەموو ئەوانەی کەوتوونەتە شێوەیەك لە شێوەکانی شیرك و بیدعەی عەقیدە لە هاوچەرخەکان.

- لە موختەسەری تەفسیرەکان وریابە، زۆر جار ئەو کەسەی کورتی دەکاتەوە دەچێت بیروبۆچوون وهەڵە و بیدعەو لادانی خۆی دەخاتە نێو کتێبە کورتکراوەکە، موختەسەری تەفسیری الصابونی بۆ تەفسیرەکەی ابن کثیر وەکو نموونە.

- هەمیشە هەوڵبدە تەفسیرێك بخوێنیتەوە کە تەحقیق و تەخریجی فەرموودەکانی کرابێت.بەلای کەمەوە تصحیح کرابێت.

- لەوەش گرنگتر هەرکەسێك لەسەر عەقیدەو مەنهەجێکی ڕاست نەبوو و بە بیدعەوە لادانە کۆن و هاوچەرخە کانەوە لە عەقیدەدا تێوەگلابوو تەفسیری نەخوێنرێتەوە، چونکە ئەو کەسانە ئەگەر خێر یان تێدا بوایە خۆ یان لە گومڕایی رزگار دەکرد، چجای بچن ڕێنوینی خەلکی بکەن بۆ ڕێگەیەك کە خۆیان ونیان کردووە و (فاقد الشيء لا يعطيه)!

- هەموو کتێبێك کە دانەرەکەی ناوینا تەفسیر مەرج نییە تەفسیر بێت، ئەو نموونەی کە پێشەوا الذهبي هێنایەوە لێرەدا بە تەفسیری فەخری ڕازی و داوای کرد نەخوێنرێتەوە نموونەیەکی جوانە، زانایان فەرموویانە تەفسیری ڕازی هەموو شتێکی تێدایە تەفسیر نەبێت! هەمان ئەم وەسفە بۆ تەفسیرێکی هاوچەرخ کراوە کە بریتییە لە تەفسیری (الجواهر) لە نووسینی الطنطأوي الجوهري کە بیخوێنیتەوە بە هیچ شێوەیەك هەست ناکەیت کتێبی تەفسیر دەخوێنیتەوە!



## ڕاو بۆچوونی زەهەبی دەربارەی زانستی (أصول الفقه)

سەبارەت بە ئەو زانستە، سەرەتا ذهبي ڕوو دەکاتە ئەو کەسانەی کە بە چاونوقاوی شوێنی مەزهەبەکان دەکەون و (مقلد) وشوێنپێ هەڵگرن بەبێ داواکردنی بەڵگە ودەڵێت:

ئێوە هیچ پێویستییەکتان بە زانستی (أصول الفقه) نییە!

ئینجا دەڵێت: ئەی ئەو کەسەی پێی وایە دەرگای کۆشش و ئیجتیهاد داخراوە و زانای موجتەهید نەماوەو و سوودێك لە ئوسوڵی فیقهدا نییە، مادام موقەللیدی (أصول الفقه) ت پێویست نییە، ئەو زانستە بۆ کەسێك باشە لە کاتی پێویستدا بەدوای بەڵگەکاندا بگەڕێت و بەراوردیان بکات و زانست لە سەرچاوەکانی خۆیەوە وەربگرێت، جا کە تۆ لە هەموو شتێکدا چاوت نوقاندووەو بە قسەی ئیمامەکەت دەکەیت، خۆت بەو زانستەوە ماندوو مەکە، چونکە دەبێتە بەڵگە و حوجحە بەسەرخۆتەوە، خۆ ئەگەر بۆ ئەوەش دەتەوێت ئەو زانستە فێر بیت نانی پێ بخوێت و وەزیفەی پێ بەدەست بهێنێت، ئەوەش هەر کارێکی خراپە.

له نوسخه‌یه‌كی تری (زغل العلم)دا، كه دیاره زه‌هه‌بی ده‌ستكاری كردووه له‌وێ، چه‌ند وشه‌یه‌كی زیاتری تێدایه جیاواز له‌و نوسخه‌ی من پشـــتم پێ به‌ســـتووه و ده‌ڵێت: زانســـتی (أصــول الفقه) ئامرازی ئیجتیهاد كردنه و، ڕێگه‌یه‌كه بۆ به‌كارهێنانی به‌ڵگه شــه‌رعییه‌كان، جا ئه‌گه‌ر كه‌سێك ئه‌و زانسته‌ی به‌ده‌ست هێنا و پێچه‌وانه‌ی حه‌ق كاری كرد و بۆ ئه‌وه به‌كـاری هێنـا به‌ڵگه‌كـان به‌زۆر له به‌رژه‌وه‌نـدی مه‌زهه‌به‌كه‌یـدا به‌كـار بهێنێـت، ئه‌و زانســـته ده‌بێته حوججه‌یه‌ك به‌سه‌رییه‌وه و له قیامه‌تدا ده‌بێته زیان و ده‌ره‌نجامی خراپ بۆی.

هه‌وڵ ده‌ده‌ین له ڕۆشنایی ئه‌و چه‌ند دێڕه‌ی پێشه‌وا شمس الدين الذهبي ده‌رباره‌ی (أصول الفقه) له كتێبه‌كه‌یدا نووسیوێتی، به‌چه‌ند ده‌ره‌نجامێكه‌وه ده‌ربچین و هه‌ندێ دیدو سه‌رنجی تری له ڕۆ شنایی قسه‌ی زانایاندا بۆ زیاد بكه‌ین:

١- له ره‌خنه و تێبینییه كانی پێشـــه‌وا شـــمس ا لدين ا لذهبي ده‌رده‌كه‌وێت زۆر بێزار و پڕه له‌وانه‌ی به‌بێ وردبوونه‌وه له به‌ڵگه‌كان شـــوێنێ مه‌زهه‌بێك له مه‌زهه‌به‌كان ده‌كه‌ون و وه‌كو ئه‌وه‌ی پێیان بلێ (أصــول الفقه) بۆ كه‌ســێك باشــه به مێشــكی كار بكات و به‌دوای

بەڵگە کا ندا بڕوات و بەراورد یان بکات و دەرەنجام لە مەسەلە شەرعییەکە جوان تێبگات، جا دەڵێت کە ئێوە دەرگای بیرکردنەوەو کۆششتان لەسەر خۆتان داخستووەو دەڵێن هەرچی پێشەوایانی مەزهەب وتیان هەر ئەوە تەواوە و قابیلی گفتوگۆ نییە!

کەواتە بەو زانستەوە خۆتان ماندوو مەکەن.

٢- ئوسوڵییەکان - هاوشێوەی تەفسیر و زانستەکانی تر - دەبێت فێرخوازی زانست بزانێت لە کامیان ئەو عیلمە وەردەگرێت، چونکە زۆرێکیان ئەو زانستەیان بەکار هێناوە بۆ سەرخستنی مەزهەبی فیقهی و بەڵکو عەقیدی خۆ یان، ئەگەر بێت و کەسێکیش زۆر شارەزا نەبێت کە سی ئوسوڵی دەتوانێت بە باتڵ و بەبیدعەی خۆی قەناعەت بەو خوێنەرە بکات چونکە هەندێ جار زانستی ئوسوڵ دەبێتە جۆرێك لە فەلسەفە و مەنتیق!

ئەوەش جێگای تێڕامان و ڕاوەستانە.

٣- زۆرێك لەو بنەما ئوسـوڵییانەی ئەو زانایانە باسـی دەکەن بە سـوودن و بەڵگەی قورئان و فەرموودەی لەسـەرە و یارمەتیدەرێکی باشـە بۆ تێگەیشـتن لە بەڵگە و لە سـەرچاوەکانی زانسـت، بەڵام هاوکات دەبێت وریا بیت چونکە لە بەرانبەردا، زۆرێکی تریش لەو بنەمایانەی کە دایانتا شیوە بەڵگەی ڕوونی کیتاب و سوننەی لە سەر نییە و بگرە ئەو دانەرە خۆیشـی ناتوانێت بە بەڵگەی شـەرعی و قـایلکەر ڕوونی بکـاتەوە، چونکە مەسـەلەکـانی علم الكلام زاڵە بەسـەریاندا و هەندی جار دەکەونە ژێر کاریگەری زانایانی بواری مەنتیق و فەلسەفەش.

٤- لە سـەردەمی زەهەبیدا دیارە ئەم زانسـتە ڕێگەیەك بووە بۆ بەدەست هێنانی وەزیفە و دامەزراندن لە قوتابخانە و خوێندنگاکاندا، کە وەکو پێشـتر ئاماژەمان پێکرد بە گشـتی لە دەسـتی ئەشـاعیرەدا بوونە، بۆیە دەڵێـت ئەگەر بەو مەبەسـتە فێری دەبیـت و بۆ ئەوە دەمارگیری بۆ مەزهەبەکان پێ بچەسـپێنێت ئەوە دەرەنجامی بۆ دوا ڕۆژت خراپ دەبێت.

٥- ئەم زانستە بۆ فێرخوازی سەرەتایی نییە، بەڵام بۆ زانایان و بۆ طالب علم ی پێشکەوتوو گەلێك گرنگ وپێویستە، تەنانەت محمد الأمين الشنقيطي دەڵێت هەر زانایەك لەو زانستەدا تەواو اشارەزا نەبێت وەکو عامی ونەخوێندەوار وایە، وتەیەکی بەناوبانگیش لەناو ئەهلی عیلمدا هەیە دەڵێن: (من حُرِمَ الأ صول، حُرِمَ الو صول)، واتە: ئەوەی لە زانستی (أصول الفقه) بێ بەش بێت بەمەنزڵ ناگات!

بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە لە کێ وەر یدەگر یت و لە کام کتێب دەیخوێنیتەوە!

٦- زانستی (أصول الفقه) زانستێکی ئاسان نییەفیرخوازی سەرەتایی بتوانێت لێی تێبگات، تا ڕاددەیەك وەکو زانستی ڕێزمان و تەجوید و قیرائاتی قورئانە دەبێت لە مامۆستایەك وەربیگیردرێت، بەڵام بۆ فێرخوازی پێشکەوتوو کە قۆناغێکی لە وەرگرتنی زانستدا بڕیبێت، خۆی دەتوانێت سوود لە کتێب و سەرچاوەکانی ئەو زانستە وەربگرێت.

٧- شارەزایانی ئەم زانستە دەڵێن فێرخوازی زانست جگە لەوەی کە پێویستە ئەو زانستە لە شەیخێکەوە وەربگرێت، دەبێت دووبارەشی بکاتەوە و ڕاهێنانی لەسەر بکات و ئەگەر بۆ خۆیشی بوە بیلێتەوە و موراجەعەی بکاتەوە.

٨ - ئەهلی عیلم و شارەزایانی ئەم بوارە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەم زانستە دەبێت بە چەند قۆناغ و ئاستێك وەربگیرێت، بۆیە من ناتوانم لێرەدا بەرنامەیەکی لەو شێوە بۆ فێرخوازی زانست دیاری بکەم، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەگەر مەتنێکی پوختی وەکو (نظم الورقات)ی العمريطي و شەرحەکەی ابن عثيمين لەسەری وەربگیرێت، هەروەها بۆ ئاستێکی بەرزتر کتێبی: (مذكرة اصول الفقه) ی الشنقيطي کە شارەزایان بەیەکێك لە باشترین کتێبەکانی أصول الفقه ی هاوچەرخ ناوی دەبەن بخوینرێت بە وانە کارێکی باش و بە سوودە.

٩ - لە قسـەکانی پێشـەوا زەهەبی دەتوانین ئەوە تێبگەین کە ئەو زانسـتی (أصـول الفقه) بە زانسـتیکی پڕ بایەخ دەزانێت، بەڵام موقەلیدەکانی زەمانی خۆی بۆ وەرگرتنی ئەو زانسـتە بە شـایسـتە نـازانێـت و دەڵێـت ئێوە خەریکی تەقلیـد و شـوێنکەوتنی بێ وردبوونەوەو بێ بەڵگەی خۆتان بن، ئەو زانسـتە بۆ کەسـێك باشـە بەدواداچوون بۆ بەڵگەکان بکات و لە جەوهەرو (مناط)ی مەسـەلە شەرعییەکان تێبگات و زانست لە سەرچاوەکانی خۆیەوە وەربگرێت.



# تێبینییەکانی لەسەر زانستی بنەماکانی ئایین لەسەردەمی خۆیدا

پێشەوا شمس الدين الذهبي لەو بارەوە دەڵێت: بنەماکانی ئایین ناوێکی مەزنە و لەسەر پاراستنی کیتاب و سوننەت جێبەجێ دەبێت، چونکە تەنها ئەو دوو سەرچاوەبریتین لە بنەماکانی ئایینی ئیسلام، بەڵام وەکو ناوی زانستەکە بەلای هەر کۆمەڵێکەوە ناوێکی جیاوازی هەیە.

مەبەستی ئەوەیە بە (علم التوحيد و علم العقيدة وأصول السنة و الفقه الأكبر و الشريعة) دەناسرێت، لەلای غەیری ئەهلی سوننەش ناوی تری هەیە وەکو (الإلهيات وعلم الكلام و ما وراء الطبيعة) و ناوی تر.

دوای ئەوە دەڵێت: بنەماکانی دینی سەلەف بریتییە لە باوەڕ بە الله عزوجل و، بەو کتێبانەی کە ناردوونی و، بە پێغەمبەرەکانی (عليهم السلام) و، بە مەلائیتەکانی و، بە سیفاتەکانی و، بەقەدەر و، بەوەی کە اله تعالى قورئانی دابەزاندووەو مەخلوق نییە،

هەروەها پاڕانەوە لە الله تعالى كە لە هەمو هاوەڵان ڕازی بێت و تاكو كۆتایی بنەماكانی تر كە ئیمام ئەحمەد لە كتێبە بەناو بانگەكەیدا (أصول السنة ) ڕوونی كردوەتەوە.

دەڵێت: بەڵام بنەماكانی دینی خەلەف واتە ئەوانەی بە سەردەمێك دوای ســـەلەف هاتن، بریتییە لەوەی كە لە كتێبەكانیاندا هاتووە و لەســـەر عەقل و مەنتیق دامەزراوە. لێرەدا بە ڕونی دەردەكەوێت كە زەهەبی زانســـتی عەقیدەو بنەماكانی ئایین دەكاتە دوو بەشـــەوە: بەشـــێكی ئەوەیە كە لە هاوەڵان و لە شـــوێنكەوتوانیان لەســـەدە باشـــەكانە كە لەســـەر بنەمای كیتاب و ســـوننەت وەرگیراوە ئەوە پێویستە وەربگیرێت و موسوڵمان دەبێت لەسەر ئەو ڕێبازە بێت.
بە شێكی تریشی ئەوەیە كە لە ڕیگەی ئەهلی بیدعەوە هاتووە و لە جیاتی ئەوەی كیتاب و ســـوننەت بكەن بە پێشـــەنگ و پێشـــەوای خۆ یان، عە قڵ و مەنتیقیان كردووەتە پێشـــەنگی خۆ یان و زاڵیان كردووە بەســـەر دەقەكاندا، بەتایبەتی موعتەزیلە و ئەشـــاعیرە عەقڵ دەكەنە بنەمایەك دەگەڕێنەوە بۆی و ئەوەشی لە رێگەی پێغەمبەرانەوە هاتووە علیهم السلام دەیكەن بە پاشكۆی،

جا هەرچی لەگەڵ عەقڵیاندا گونجا وەریدەگرن و ئەوەشی کە نەگونجا تەئویلی دەکەن و ڕەتیدەکەنەوە. ئەمەش بە پێچەوانەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە دەڵێن بنەمای دینداری دەقەکانە و عەقڵ پاشکۆی ئەو دەقانەیە، ئەگەر پێچەوانەکەشی راست بوایە وەکو تاقمە گومڕاکان دەڵێن ئەوا لە ڕاستیدا پیویستییەك بۆ ڕەوانەکردنی پێغەمبەران علیهم السلام و دابەزینی وەحی نەدەما.

لەمە بەدوا قسەکانی شمس الدین الذهبي جۆرێك لە ناڕوونی مەبەست و تیکەڵ بوونی دەربڕینەکانی تێدا درووست دەبێت، هەروەها جۆرێك لە سیاسەت نیشان دەدات بەوەی کە قسەیەك دەکات زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرێت، بەتایبەتی سەبارەت بە (ابن تیمیة)ی مامۆستای جارێکی تر لێرە ڕەخنە و ستاشی بۆی تێهەڵکێش کردووە، نازانیت مەدحی دەکات یان زەم!

دەربارەی ئوسوڵییەکان لەسەر مەنهەجی خەلەف دەڵێت:

هەرکەسێك لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەت و فەرموودەکاندا بێت پێی دەڵێن (مجسم) و(حشوي).

ئەوەشـــی لە هەموو مەســـەلەیەکدا تەئویل بکات  پێی دەڵێن: (جهمي) و(معتزلي).

ئەو کەســـەش هەندێکی تأویل بکات و هەندێکی جێگیر بکات پێی دەڵێن: (متناقض) واتە بەوە تۆمەتباری دەکەن قســـەکانی دژ بەیەکن وخۆیشی نازانێت چی دەڵێت!

بۆیە الذهبي دەڵێت: (العافية أولى بالمرء).

کە بێگومان ئەو عافیة و ســـەلامەتییەی باســـی دەکات ئەوەیە دەست بە کیتاب و سوننەتەوە بگریت و هەمو شتێك بکەیتە پاشکۆی ئەو دوو بنەمایە.

ئینجا ڕوو دەکاتە ئەو کەســـەی کە ســـەرقالە بەو زانســـتەوەو دەیەویت لە عەقڵ و نەقڵ و لە دەقەکانی کیتاب و سوننەت و قسەی ئەهلی کەلامدا جۆرێك لە گونجاندن درووســـت بکات، پێی دەڵێت: ئەگەر تۆ لە بنەماکانی ئایین و پاشـــکۆکانیدا وەکو مەنتیق و حیکمە بووی بە کەسـێکی لێهاتوو، لەگەڵ ئەوەشـــدا  دەســـتت بە کیتاب و سـونەت و بنەماکانی سـەلەفەوە گرت و(ولفقت بين العقل والنقل) واتە هەوڵتدا عەقڵ و نەقڵ تێهەڵکێش بکەیت بۆ خزمەتی ئیســـلام،

پێی دەڵێت ئەگەر بەو مەنهەج و ڕێبازەوە کار بکە یت، هەرچە ند بەتواناو کارامە بیت، وا نازانم بگەیتە ئاست و پلەو پایەی شێخ تقي الدين ابن تيمية بەڕەحمەت بێت، لەگەڵ ئەوەشـــدا بينيت ئەو چی بەســـەردا هات و چەند هێرشـــی توند و ناشـــيرينی کراوە ســـەر، لەکاتێکدا ئەو پێش ئەوە لەســـەر ڕێبازی ســـەلەف بوو، مەبەســـتی ئەوەیە کە ئەحمەد و پێشـــەوايانی تری ســـەلەف تەنها بە قال الله و قال الرسول ﷺ قسەی دەکرد، بەڵام دوای ئەوە شێوازی تری گرتە بەر، بۆیە دەڵێت ابن تيمية بە هۆی ئەوەوە لەلای کۆمەڵێك بە دەججال ودرۆزن و کافر ناودەبرا، لەلای کەســـانێکی تری زاناو بەڕێزیش ابن تيمية موبتەدیعیکی بەڕێز و بەتوانا بوو!

مەبەســـتی ئەوەیە بە هۆی ئەوەی کە توانی عەقڵ بۆ پشـــتگیری سونەت بەکاربێت و بەهەمان چەکی بیدعەکاران لەو موبتەدیانەیدا! دەڵێت بەلای یاران و هاوەڵانیشـــیەوە بەرگریکار بوو لە بنە ما و سنوورەکانی ئایین و هەڵگری ئاڵای ئیسلام و داکۆکیکار ر بووە لە سوننەت.

لە یەکێك لە نوسـخە کانی کتێبەکەشـدا بەدوای ئەو دەربڕینە دەڵێت: (هو ما أقول لك) واتە منیش لەگەڵ ئەوانەدام کە ئەویان بە پێشەواو بەرگریکار زانیوە لە ئایین و لە سوننەت.

پێشـتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە زەهەبی ڕای جیاوازی هەبوو لەگەڵ ابن تیمیة ولەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەو ئەو شـێوازە نەبوو لە ململانێ کە ابن تیمیـة و هـاوەڵانی ئەنجـامیـان دەدا، ئینجـا لێرە ڕەخنەیەکی تریشـی لێ دەگر یت، ئەویش ئەوەیە کە ابن تیمیة بۆ ڕەددانەوەی موبتەدیعەکان ناچار بوو خۆی فێری علم الكلام بکات و هەروەها خۆی لە منطق و لە فلسـفة شـارەزا بکات بۆ ئەوەی بەو چەکەی کە ئەوان شەڕی پێ دەکەن بە ڕوویان بوە ستێتەوە، ئەمەش جێگای ڕەخنە بوو لەلای الذهبي کەدەڵێت: باشـتر بوو هەر لەسـەر مەنهەجی سـەلەف و دوور لە شـێوازەکانی (متكلمين) بەرگریت لە سـوننەت بکردایە و خۆت نەخسـتایەتە ناو ئەو کێشـمەکێشـەوە کە دواجار ڕێگەت بەواندا هەر لە قسـەکانی خۆتەوە کە ڕەدیان دەدیتەوە وابەسـتەی هە ندی بۆچونی ترت بکەن ئەوەی کە بە (الإلزا مات الباطلة) ناوی دەبات.

هاوکات زەهەبی سـەرەڕای ڕەخنەگرتنیشـی لە مامۆسـتاکەی ئەو ئیلزاماتەی نەیارەکانیشـی ڕەتدەکاتەوە و دواجار بە شـێوەیەك لە شـێوەکان پشـتی مامۆسـتاکەی هەر بەرنادات، بەڵام ڕەخنەی لێدەگرێت و دەڵێت خۆزگە خۆتت نەخسـتایەتە نێو ئەو دۆحە ناخۆشەوە، بێگومان ئەوە ڕاوبۆچوونی زەهەبی خۆیەتی و ئەوەی من بـاوەرم پێیەتی لەم بـارەوە ئەوەیە ڕێبـازی ابن تیمیـة تەواوتر بوو لەبەرگری کردن لە ئیسـلام و لە سـوننەت و پوچەڵکردنەوەی باتلی تاقمەکان، بەو هەڵوێسـت و غیرەت و کۆشـشـەی زۆرەی لە پێناو ئیسـلامدا، ابن تیمیة بوو بە هێما و پێشـەواو پێشـەنگێك الله أعلم تا ڕۆژی قیامەت زۆرێك لە موسـوڵمانان وەکو مامۆسـتا، بەڵکو وەکو قوتابخانەیەك تەماشـای دەکەن کە سـەدان و هەزاران مامۆسـتا و نووسەر و بەرگریکاری لەئیسلام لێ دەرچوون.

تەنانەت خودی الذهبي ناوی لە مێژوودا وەکو زاناو نووسەرێکی گەوە پارێزراوە، بەڵام ابن تیمیة ناوی لە مێژوودا چەسپا وەکو زانا و نوو سەر سەرکردەو کە سایەتییەکی ئازا و بەغیرەت کە بە نەزەری و بە کردەیی هەموو ژیانی لە پێناو بەرگریکردن لە دینەکەی بەسەر برد و لەو پێناوەشــدا باجی گەلێك قورســیدا، هەر بۆیە بەو گەورەییە لە مێژوودا ناوی بە پارێزراوی مایەوە.



## بۆچوونی دەربارەی زانستی مەنتیق و فەلسەفە

پێشەوا شمس الدين الذهبي دەربارەی (علم المنطق) بە کورتی و بە پوختی دەڵێت: زانستی مەنتیق سوودی کەمە و زیانی زۆرە و لە زانستەکانی ئیسلامیش نییە، ئەوانەشی کە راستە و حەقە لەو زانستەدا لەرا ستیدا خۆی لەناخ و دەروونی کە سە پاکەکاندا بوونی هەیە و مەعلومە بەبێ هیچ پێویستییەك بەو زانستە، بۆ نموونە هەموو کە سێك دەازنێت پێ شەکی دەبێتە هۆکاری درووستبوونی دەرەنجام، یان ئەوەی کە دەڵێن هەموو ژمارەیەکی جووت دابەش دەبێتە سەر دوودا !

ئەو جۆرە بنەمایانە عیلمی مەنتیقیش نەبێت خەڵکی هەر خۆیان دەیزانن!

ئەوەشی کە دەمێنیتەوە باتڵە و لێی هەڵبێ و دەستبەرداری ببە چونکە زیاتر نییە لە هەندێ دەربڕینی سەیرو سەرسوڕهینەر، لە الله تعالی داوای سەلامەتی دەکەین.

ئینجا دەڵێت: ئەگەر بۆ دونیا دەیخوێنیت نەك بۆ دوارۆژ، ئەوا هەر کات بە فیرۆ داونە و تاڵ کردنی ژیانە لە خۆت، لە خێریشی دەستت بشۆ و لە سزایشی ئەمین مەبە.

وەك دەبنین ڕاوبۆچوونی الذهبي دەربارەی زانستی منطق زۆر خراپە و هیچ باشەو ڕۆشناییەکی تێدا نابینێت و دەڵێت جاوەڕێی پاداشت مەبە لە فێربوونی و مەمنوون ئەگەر بەبێ سزا لەلای الله لێی دەربچیت.

ڕەنگە هەر ئەم هەڵوێستەی زەهەبیش بێت، کە بووە مایەی ڕەخنە و گلەیی کردن لە ابن تیمیة ی مامۆستای چونکە ئەو دوو کتێبی لەو زانستەدا نووسی: (الرد على المنطقيين) و (نقض المنطق) کە ئەو لەو دوو کتێبەدا ئەو زانستەی هەڵوە شاندووەتەوە و بەرپەرچی سەرانی مەنتیقی داوەتەوە، و بەو هۆیەشەوە توانیوێتی گفتوگۆ و مونازەرە لە گەل فیرقە ئیسلامییەکاندا بەتایبەتی موعتەزیلە و ئەشاعیرەدا بکات، چونکە ئەوان زۆر پەنایان بۆ علم الكلام بردووە و ابن تیمیةش دەبوو فێری منطق و فەلسەفە بێت بۆ ئەوەی بەرپەرچیان بداتەوە، کە بێگومان کارێکی باشی کردووە و ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە دەمکوتکردنیاندا.

## زانستی فەلسەفە:

سەبارەت بە زانستی فەلسەفەش الذهبي توندتر و تووڕەترە بەرانبەر ئەوانەی کە خەریکی ئەو زانستەن ودەڵێت: کەسێك خێری تیابێت خۆی بە فەلسەفەوە سەرقاڵ ناکات، چونکە ئەم زانستە بەلایەك و ئەوەی پێغەمبەران پێی ڕەوانە کراون بەلایەکی تر!

ئینجا دەڵێت: هاوار بۆ ئەوانەی کە گوایە چاوەڕوان کراوە بەرپەرچی فەلسەفە بدەنەوە لە کاتێکدا خۆیان سەرگەردانن، ئەبێ ئەبێت ئەوانەی کە بەرپەرچ دەدرێنەوە حاڵیان چۆن بێت؟

چارەسەی ئەم زانستە و ئەوانەش کە خەریکین ئەوەیە ڕێگە نەدرێن و ئەو کتێبانە لەناوببرێن!

لە کۆتاییشدا وەرگێڕانی ئەو جۆرە کتێبانە بۆ زمانی عەرەبی بەکارێکی ناشەرعی و هەڵە دەزانێت کە دەرنجامە خراپەکانی هەموو موسوڵمانان دەگرێتەوە.



## زانستی بیرکاری وپزیشکی:

سەبارەت بە زانستی بیرکاری و پزیشکی کە بە (الحكمة الرياضية و الحكمة الطبية) ناویان دەبات، دەڵێت: ئەوانە زانســـتی دونیایین خۆیان لە خۆیاندا نە پاداشـــت و نەســـزایان لەســـەر نییە، بەڵام بە بوونی نیەتی بـاش واتە ئەگەر ئەو فێرخوازەی فێریـان دەبێـت مەبەســتی ئەوە بێت یارمەتی خەڵکی پێ بدات و کاری موسـولْمانان ئاسان بکات، بەو شێوە دەبێتە خێر و پاداشت بۆی، ئەگینا ڕێگەیەك نین بۆ نزیك بوونەوە لە الله عزوجل.



## زانستی دابەشکردنی میراتی:

سـەبارەت بە زانسـتی دابەشـکردنی میراتی (علم الفرائض) زۆر لەسـەری ناوەسـتێت و دەڵێت ئەو زانسـتە بەشـێکە لە زانسـتەکانی شـــەرع و ڕۆچوون تێیدا باش نییە، چونکە شـــارەزایانی ئەو بوارە مەســـەلەی وا باس دەکەن ڕەنگە هەرگیز شـــتی وا لە دونیادا ڕوو نەدات.

واتە زەهەبی تەنهـا ڕەخنە لە ڕۆچوونی پســـپۆڕانی ئەو بوارە دەگرێت و داوا دەکات زێدەڕەوی بێ پاساو لەو زانستەدا نەکرێت.



## زانستی ئینشا و ڕەوانبێژی:

سـەبارەت بە زانسـتی ئینشـا و ڕەوانبێژی الذهبي دەڵێت ئەو زانستەش بە هەمان شێوە زانستی دونیاییە و پەیوەندی بە دواڕۆژەوە نییە، هەرکێ بیەوێت لەو زانستەدا کامڵ بێت پێویستە لە زانستە ئیسلامییە کاندا شـارەزایی باشـی هەبێت و عەقڵێکی باش و تێگەیشـتنێکی وردی لە ڕێزمان و زانسـتەکانی (المعاني) و (البيان) ومێژوو و شـێوازی نووسـینی وێژەییدا هەبێت. نووسـەر پێویستە سـەرمایەکەی تەقواو و چاودێری پەروەرد گاری بێت، لەوانەیە وشـەیەك بەکار بهێنێت ببێتە هۆکاری سـزادانی لەلای الله تعالى، لەوانەشـە لە دێڕێکدا گوایە داهێنانی کردووە ببێتە مایەی وێران بوونی شارێك، لەوانەیە ببێتە هۆکاری ڕشتنی خوێنێك بە ناحەق.

ئینجا ڕوو دە کاتە ئەو کەسـەی کە ڕەوانبێژە و نووسـەرێکی بەتوانایە و پێی دەڵێت: پێغەمبەرەکەت ﷺ زەمی ڕەوانبێژی کردووە و فەرموویەتی: (إن من البيان لسحرا) واتە زەهەبی واتای سیحر لەو فەرموودەیە بە شتێکی خراپ دادەنێت و نەك ستایش بێت بۆ بەلاغة

و بەیان وەکو زۆر کەس لە فەرموودەکە وا حاڵی دەبن، چونکە واتای سـیحر هەلگێڕانەوەی ڕاسـتییەکانە، کەسـی ڕەوانبێژ و بەتوانا لە قسـەکردن و نووسـیندا دەتوانێت ناحەق و باتڵ بڕازێنێتەوە و وەکو حەق پێ شکە شی خوێنەر و بیـ سەری بکات، لێرەدا بە با شی دەزانم تەنها نموونەیەك بە گومڕای بەناوبانگ عدنان إبراهيم بهێنمەوە، ئەو بەهۆی توانای قسەکردن و خۆبادان و بەکارهێنانی زمانی جەستە کە لە کاتی قسەکردنیدا هەموو لاشەی دەجولێنێتەوەو سەرنجی بەرانبەر بۆخۆی ڕادەکێشـێت، هەروە ها بەهۆی جۆر ێك لە ڕەوانبێژی و توانای وتار و قسـەکردن لە ڕووی ڕواڵەتەوە، دەبنین زۆر ناحەق و باتڵ و بیدعەی لە شێوازێکی جواندا - لە کاتێکدا خۆی نا شیرینە - دەخاتە ڕوو وبۆ بەرانبەر پێشـکەشـی دەکات، لە کوردسـتانیشـدا بە حوکمی ئەوەی هەندێ کەس و لایەنی لادەر و گومڕا کاریان لەسەر ناسـاندن و وەرگێڕانی نووسـین و ڤیدیۆکانی کرد و پێیانهەڵدا بۆ ماوەیەك توانییان خۆڵ لە چاوی خەڵکی بکەن وجە ماوەرێکی بۆ پەیدا بکەن بەرلەوەی کەسانێك پەردە لەسەر ڕووی ڕاستەقینەی ئەو ناوبراوە و بیروڕاکانی دژ بە سـوننەت و پشـتگیری ئاشـکرای بۆ ئەهلی بیدەع هەڵماڵن و ئاشکرا بکەن،

ئێستا الحمدلله مەگەر کەسێك تەواو بێ ئاگا بێت کورد واتەنی لە گوێی گادا خەوتبێت، یان کەسێك زۆر گومڕا بێت و مەبەستی بێت لەناو کورددا زیاد لەوەی کە هەیە گومرایی بڵاو بێتەوە، ئەگینا کەس نەماوە حەقیقەتی ئەو ڕەوانبێژە ساختەی بۆ ڕوون نەبووبێتەوە!

ئەوەیە واتای فەرموودەکە کە هەندێ بەیان سیحرە، واتە کەسەکە ڕاستیەکان تێکەڵ دەکات و بە قسەی بریق و باق سەر لەبەرانبەرەکەی دەشێوێنێت، لەو ڕوانگەشەوە الذهبي ڕەوانبێژی و ئینشا ڕەتدەکاتەوە و بە ئامرازێکی خراپی دەزانێت کە لەسەردەمی ئەودا - بێگومان لەسەردەمی خۆیشماندا زیاتر - کاریگەری خراپی بووە.

بێگومان مەبەستی بەکارهێنانی ئەو زانستە نییە لە چاکەدا چونکە ئەوە کارێکی باشە و پاداشتی لەسەرە.



## زانستی هۆنراوە:

دەربارەی زانستی شیعرو هۆنراوە دەڵێت: شیعر وتەیە، جوانی جوانە و ناشیرینی ناشیرینە و ئەمەشیان زاڵە بەسەریدا، چونکە سەرمایەی شاعیران زیاتر درۆیە و زێدەڕەوییە لەو کەسەی ستایش دەکرێت و یان دادەشۆرێت و بە شێوەیەکی گشتی بابەتەکانی شیعر تاکو درۆی زیاتر تێدا بێت دەڵێن خۆشترەو بەتامترە!

بێگومان تاکو ئەم سەردەمەی خۆشمان هەروایە و من وەکو پسپۆڕێك لە بواری زمان و ئەدەبی عەرەبیدا ئەو حەقیقەتە بەچاوی خۆم وەدی دەکەم و دەربارەی شیعر، حاڵ بەوە گەیشتووە عەیبەیەکی تێدا نییە کە دەوترێت: (أعذب الشعر أكذبه) واتە: خۆشترین شیعر و هۆنراوە ئەوەیە کە زۆرترین درۆی تێدا بێت، (ئەڵبەتە زۆربەی ڕۆمانەکانیش هەر بەو شێوەن) بۆ نموونە پیاهەڵدان و وەسفی کەسێك دەکات بەدرۆ باڵی لێ پەیدا دەکات و دەیکات بە کەسێك لە هەموو خەڵکی باشتر و پیاوتر و بەخشندەتر خۆیشی وا نییە، یان وەسفی جوانی ئافرەتێك دەکات دەڵێت لەمانگ و گوڵ و ئاسك جوانترە،

یان باســـی خۆی دەکات ڕاســـتێك و چەندین درۆ تیهەڵکێش دەکات کە زەهەبی خۆی نموونەی المتنبي و البحتري لەو جۆرانە هێناوەتەوە، یان کە سێك دە شکێنیتەوە و دەیکات بە شەیتان هەموو ئە مانە درۆی تێدا نەبێت، بە هیچ شـــێوەیەك ســـەرنجی خوێنەر ڕاناکێشێت! تەنانەت دەڵێن: حسان بن ثابت الله لێی ڕازی بێت کە لە ســـەردەمی جاهیلیدا شـــاعیرێکی گەورە و بەتوانا بووە، بەڵام لە ســەردەمی ئیســلامدا ئاســتی وەکو شــاعیرێك لە ڕووی هونەرییەوە دابەزی، بێگومان هۆکاری ئەوەش بۆ دوورکەوتنەوەی حەســـــان دەگەڕێتەوە لە هەموو جۆرە درۆو وزێـدەڕەوییەك لە قســـەکردن و بوختان نەکردن و هەبوونی ئینساف!

کە هەمووی بە کاریگەری ئیسلامەوە بووە لەسەرەی .

دوای ئەوە دەڵێت: شیعر هەندێ جار سەر لە کوفرەوە دەردەکات، بەڵێ لەم سەردەمەی خۆیشماندا شیعر بووەتە گۆڕەپانێکی بەرین بۆ ســـووکایەتی کردن بە ئیســـلام و بە الله و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ و بە هەموو پیرۆزییەکانی، لەم بارە شەوە کتێبێکم هەیە چاپکراوە بە ناوی (نزار قباني ولوثة الفكر الحداثي في شعره) تەنها بە دواداچوونم بۆ جنێودان و ســـووکایەتی کردنەکانی نەزار قەببانی کردووە بۆ ئایینی

ئیسلام وەکو شاعیرێکی دیار و ناودار، بۆم دەرکەوت هیچ پیرۆزییەکی ئیسلام لە زمانی ئەو شاعیرە ڕزگاری نەبووە، بەهەمان شێوە محمود درویش و زۆربەی ئەوانەی پێیان دەوترێت (شعراء الحداثة) ئەڵبەتە ڕۆمانەکانیش هەمان کێشەیان هەیە وبەڵکو لەم سەردەمەدا پێشی هۆنراوەشیان داوەتەوە، چونکە ئەگەر جاران دەوترا (الشعر دیوان العرب) ئێستا دەڵێن: (الروایة دیوان العرب و العجم)، سەبارەت بە دەرخستنی دژایەتی کردنی شاعیرانی هاوچەرخ بۆ ئایینەکات بە گشتی و بۆ ئیسلام بە تایبەتی، چاکترین کتێب لەو بارەوە بخوینرێت کتێبی: (الانحرافات العقدیة في أدب الحداثة و فکرها دراسة نقدیة شرعیة) لە نووسینی سعید بن ناصر الغامد یە.



## زانستی ژمێریاری:

لە زانستی ژمێریاری دەڵێت زانستی قیبتی و فارسەکانە، بە شێك نییە لە زانستە ئیسلامییەکان، ڕێگەیەکە بۆ دابین کردنی بژێوی ژیان و خۆشـــگوزەرانی، دەشـــڵێت: ژمێریار چەند کارامەتر بێت ئەوەندە دزتر دەبێت! دیارە لە ســـەردەمی زەهەبیدا وا بووە! بەدوای ئەوەدا دەڵێـت بەڵام هەرکێ تەقوای اللـە ی هەبێـت و لەگەڵ قـازییە موســـوڵمانەکاندا کار بکات و زانســـتەکەی بخاتە خزمەتی هەتیو و کاروباری ســـەدەقە ومالە وەقفکراوەکان و قوتابخانەکان و دەســـت پاك بێت و لەو ئەمانەتەی کە دەخرێتە ژێر دەســـتی جێگای متمانە بێت ئەوە کەسێکی بەختەوەرەو لەسەر نیەتەکەی پاداشت دەدرێتەوە، دەڵێت خەڵکانێکی کەمان بینی بەو شـــێوە بوون، منیش دەڵێم: باوەڕ ناکەم ســـەردەمی خۆیشـــان لە ســـەردەمی زەهەبی لەو بارەوە باشـتر بێت! دەڵێت، هەندێ ژمێر یاری گورگیشـــان بینی وەکو مرۆڤ پۆشاکیان لەبەردا بوو! هەندێ نووسەری لای دادوەرەکانیشمان بینی لە دزیدا گەیشـــتبوونە چڵەپۆپە، گەندەڵی تەمەنی زۆر درێژە، چونکە زەهەبی زیاد لە ٦٠٠ ساڵە وەفاتی کردووە!

## زانستی دادنووسی:

هەروەها باســی زانســتێکی تر دەکات بە (علم الشرــوط) ناوی دەبات، کە بە دە ستەواژەی ئێستای خۆمان (دادنووس) و پارێزەری دەگرێتەوە، دەڵێت: ئەوە عیلمێکی شەرعییە و هەرکەسێك لێزان و لە خواترس بێت بە بەختەوری دەژی و بشــمرێت خەڵکی بەداخەوە دەبن بۆی، هەرکێیش بە فێڵ و تەڵەکە ئەو زانستە ئەنجام بدات ڕوو زەردی دونیا و قیامەت دەبێت، ئەگەر بەو حاڵەشـــەوە بگاتە پلەو پۆســت، بە ئەم ئایەتە وەڵام ئەدرێتەوە: (قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالآخرةُ خيرٌ لِمن اتَّقى).

جا زەهەبی تۆ لە سەردەمی خۆت بەو شێوە بەگلەیی و ناڕازیت! لە کوێی ئێســتا ئەم ســەردەمەی ئێمە ببینیت، کە لە بنچینەوە حوکم بەوەی الله لە قورئاندا دایبەزاندووە هەر ناکرێت و، لە جیاتی قورئان و سوننەت، کار بە یاساو ڕێسای دەستکردی مرۆڤەکان دەکرێت کە تاکو حوکمێکیان لە گەڵ شــەریعەتی ئیســـلامدا یەك دەگرێتەوە، دە حوکمی پێچەوانەیەتی ولا حول ولا قوة إلا بالله،

## زانستی ئامۆژگاری:

کۆتا زانست کە زەهەبی قسەی لەسەر دەکات زانستی ئامۆژگارییە (علم الوعظ)، دەڵێت: ئەو کەسەی خەریکی ئامۆژگاری خەڵکی دەبێت بۆ چاکە پێویستی بە زانستێکی باش هەیە، پێویستە لە تەفسیردا باش شارەزا بێت و هەروەها لە چیرۆك و بەسەرهاتی عابید وپیاوچاکاندا شارەزا بێت. بەداخەوە لەم سەردەمەی خۆماندا ئەوانەی بەو کارە هەڵدەستن سەرمایەی گەورەیان زمانێکی لووسە و ئەوەی نەیانبێت عیلمی شەرعییە و زۆربەیان لە عەقیدە و فەرموودەو سوننەتدا زۆر بێ ئاگان و لە مەسەلەی تەوحیددا بەتایبەت تا بیناقاقایان تێکەوتوون و کەچی خەریکی ئامۆژگاری کردنی خەڵکیشن، داماوینە بڕۆن ئامۆژگاری خۆتان بکەن سەرتان لە ئەلفوبێی عەقیدەو وبیروباوەڕ دەرناچێت.

الذهبي دەڵێت: بەڵام ئەگەر بینیت واعیز دینی لاواز بوو دڵنیابە وەعزەکەی لە گوێی بیسەرەکانی تێناپەڕێت! دەڵێت زۆرمان بینی لە واعیزی قسەزان خەڵکی دەهێناوە گریان و کاریگەرییەکەی تەنها

لەو کـاتەدا بوو و دوای ئەوە بیسـەران وەکو ئەوەی هیچیـان نەبیستبێت!

دەڵێت ئەگەر واعیز وەکو عبدالقادر الكيلاني بێت کەواتە گوێگر سـوودمەند دەبێت، لە ڕاسـتیدا وەعزی ئەو جۆرە واعیزانە تەنها کاریگەری لە سەر کەسانی بێ زانست و نا شارەزا لە شەرعدا هەیە، هەروەها لە سـەر ئافرەتانیش کاریگەری زۆرە بەو پێیەی ئەوان هەم عاتیفین و هەم لەم سـەردەمەی خۆماندا بەدەگمەن شـارەزاییان لە زانستە شەرعییەکاندا هەبێت،

ئەمە کۆتایی ئەو شـەرح و پەراوێزانە بوو کە بە کورتی لەسـەر کتێبی (زغل العلم) ی پێشـەوا شـمس الدين الذهبي نووسـیمان، هیودارم بە سوودبووبێت بۆتان و لە نزای چاکەتان بێ بەشمان نەکەن.

# ناوەڕۆك